# دیوانی
# ئەحمەد محەمەد

شیعر

کۆی بەرهەمە شیعرییەکان

# لێم مەپرسە

لێم مـەپرسـە ، بۆ ئێواران لـەتەنیـایی تەنیـاترم
چونکە گوڵم هەنگاو ئەنێم بەرەوماڵی ساردو سڕم
خـەڵکی ڕێیان چـراخـانەو داگیرسـاوی زەمـانەیە
ڕێگەی منیش وشک و خامۆش، ئاسەواری وێرانەیە
بەم سووتانەش کەس نازانێ کە دڵ پشکۆی ئاگردانە
تەنیا عـومـرم ئـاگـادارە ، ئەویش ئەڕواو بێ ویژدانە
تەمـەنیشم ، وەکو گەڵا لـەبەر پێما هـەڵوەریوە
پرسەی خەمە قژی ڕەشم بەلاوی ڕەنگی گۆڕیوە
لەئامێزی ئەمشەو چیبکەم کە مانگ ون بێ لەدیارم
وەکو نەخشی سەر ئاو نەما، نیگاری جوانی ڕۆژگارم
دەی شەقامی ئێوارانم، جوان لە بالام وردبەرەوە
وەرە هـاوڕێی ئێـوارانم بـاوەشتم بۆ بکـەرەوە

# عەشقێکی وێڵ

دەپێم بڵێ تۆچۆن عەشقی کەسێک ئەبی کە نەیناسی
چۆن سەرنجت بەرۆخساری نامۆیما هەڵئەواسی
لەدوورەوە کورەی هەستت شوعلەیەکی بەتین ئەدا
بەچاوی من عاشق مەبە، کەم لەدەرگای ئەوین ئەدا
من هۆگری عەشقت نابم ، چونکە دڵم ماڵی ژانە
لەسەرمایەی خۆشەویستی تەنیا بەشم دابڕانە
دەتۆش برۆ بۆ لای کەسێک کەبیر لەخەم نەکاتەوە
دنیا بارکا باکی نەبێت ئاوڕ لەکەس نەداتەوە
من ناتوانم ، لەم شارەدا لوتکەی تەلار بەرمە ئاسمان
خۆشەویستی ئەمرۆ بۆتە فڕین بەرەو چاوگەی سامان
منیش خوانی عەشقێکی تر بۆ هیچ کەسێک ناکەمەوە
ئیتر دڵی هیچ رێبوارێ بۆ ماڵی دڵ نابەوە

# تەمەن

ئەی تەمـەنی پڕ ئەسرینم ئەڕۆی ئـاوڕ نـــادەیتەوە
لەگەڵ هەموو هەنگاوێکتا لە عومری من ئەسڕیتەوە
خۆزگە منیش وەک پەپوولە گشت تەمەنم وەرزێک بوایە
دوور لـە خـەم و تـاڵی ژیـان ، تەنیـا گـوڵم بنـاسیـایە
ڕێگام سەودای تەنیاییەو کەسێک نایەت بۆ سەردانم
ئیتر چیبکەم لەم تەمـەنە کە لەهـەمووی پەشیمانم
لـەگـریـانی منـاڵیمـا ، پێکـەنینـم بـەخـەم ئەهـات
کەچی ئێستا خەم دەریایەو بۆ کەنارم شەپۆل ئەدات
لە سەد جـارا تەنیـا جـارێ ، زەردەخـەنە دێتـە میوان
وەک سێبەری لای ئێوارەی خۆرنشینی دار ئەرخەوان
ئەی هـاوڕێیان چـاوم نووقمی نیگارێکی پڕ بەهارە
تاسەم وەری بەڵام هێشتا خۆشەویستیم هەربێدارە
ئێستاش گەڵای عومری گەنجیم وەکو پاییز هەڵوەریوە
کـێ وەکـو من تەم و غـوبار پەنجـەرەکـەی داپۆشیوە

# عەشقباران

لەو ڕۆژەوەی عەشقباران خەمی ئێمەی گرتە ئەستۆ
ڕەنگی دووری یەکمان لێ نیشت، تۆ بۆ من و منیش بۆ تۆ
چاوەڕوانیت غوربەتێکە ئالاوەتە تێڕوانینم
بێ ڕەنگاڵەی خۆشەویستیت ئاریزێکی پڕ ئەسرینم
بۆچی نایەی وەک خۆرەتاو لێم ڕۆشن کەی ژینی تارم
وەکو شنەی بێ وەنەوشە دێم و دەچم ڕەنج خەسارم
ڕێگەی دوورم یادی تۆیە مەڕۆ نەبا نەتبینمەوە
تۆ بارانی بۆ پشکۆی دڵ برژێرە نێو ئەوینمەوە
دەبڕوانە هەردوو دیدەم سیاپۆشی ڕەنگی تۆیە
ڕێگەم بەرەو تەنیاییەو دڵم کەیلی دەنگی تۆیە
دەسا وەرە لەم غرووبە دەرمبێنە بەیەکجاری
لە دووری تۆ گۆشەگیرم ئاودامانم لەبێزاری

# ئاوێنەی عەشق

کـە ئـاوێنـەی عـەشقی تـۆ بـووم
بەچەخماخەی دڵ و چاومان لەیەکمان دا ..
دوو کـۆتـری سـپی سـرِ بـووین
بەم ئەوینە، بۆ یەکتری لەباڵمان دا ..
شەپۆلی خەمی ئەوینم، لەگەڵ عەشقت دەستی پێکرد !
خەمی دووریت زەردەخەنەی لەسەر لێوی منا ئەبرد !
هێندەی دەریا شەپۆل ئەدەم، تاکو بگەمە کەناری تۆ
گەڵارێزان لە من باری نەمدی سایەی ژێر داری تۆ
هێشتا چـرۆی باخـی عەشـقم سـەوز نەبوو ، تۆ جـێت هێشـتم
سادەو ساکار بووم بۆ نەخشەت، تاڵی و سوێری ڕێت پێ چەشتم
دەریای دڵم هـەموو ساتێ پرِ نهێنی ڕازی تۆ بوو
چاوانیشم پرِ سەرنجی ساز و سەفای نازی تۆ بوو
ئێستاش عەشقم وردەگەڵای بێ نازکەوتووی بێ سامانە
لای تۆش چەمی سەرهـەڵگرتووی ژێر بارانی بەهـارانە
وتم مـەڕۆ ، تەنیام مەکەو خەندەی ڕۆحـم مـەتارێنە
گەر ڕۆیشتی، تەرزەی ڕقت لەسەر عەشقم مەبارێنە
وتم مـەڕۆ، بەهار دێت و خونچەی باغم بۆت ئەپشکوێ
هەرچەن ڕۆشتی بەڵام نەتوت بێوەفایی ئەبەی بۆ کوێ

# عاشقان

وەرن وەرن عاشقان ڕووبکەینە مامە یارە
سەردەمێکە دابڕان ئەبارێ لەم هەوارە
عاشقانی دڵشکاو هانا بۆ یەکتر بەرن
ڕشبەڵەکی لێ سازکەن وەک ملوانکە هەڵپەڕن
ڕۆحی گۆران میوانکەن بۆ وەسفی عەشقێکی پاک
دیوانە بۆ شەم بژی و نالی بۆ حەبیبەی تاک
دەبا پەلکەزێڕینە تەسریحەی ڕەنگاڵە بێ
سەرچۆپی وەنەوشەی ئاڵ ڕازاوەی ئەم یاڵە بێ
لەگەڵ نازی پەنهانی ساتێک وەرەو بمدوێنە
چرای خۆشبەختی ژیان لەڕێما داگیرسێنە
بۆ سەرنجی باڵای تۆ بێ ئارامە چاوی من
هەرگیز لێت خامۆش نابێ ، عەشقی داگیرساوی من
چاوت وەکو خۆرەتاو پرشنگی لێ ئەبارێ
لارو لەنجەی سەرەڕێت شۆخ و شەنگە بەجارێ
بەرگی سادەو ساکارت نەخشاوە لەخۆت جوانە
وەرە هەناسەو دیدەم ئەمە وەرزی ژووانە

# فرمێسکباران

دەڵێم گەڕێ تازە عەشق ڕێم بۆ ڕۆشن ناکاتەوە
بەختم گەڵای بن دارێکەو تازە بەچڵ ناگاتەوە
من سێبەری درەختێک نیم کە خۆر نەما بەجێم بێڵێ
خۆشەویستی وشکی کردووم ، ئیتر دڵم بۆ ئەکێڵێ
تۆ لە جوانی ناسکتری دەستی کورتم ناگا بەتۆ
لەلای من هیچ بەدی ناکەی ، دەوازبێنەو فریومەخۆ
خۆ من کانی سەرەڕێ نیم تینووی ڕێگەی تۆ بشکێنم
چیت لێم ئەوێ کە ئەزانی سیروانیش بم وشک دێنم
گەرچی باخی شیعرەکانم وەک شێوەی تۆ گوڵبارانە
بەڵام چیبکەم پێکەنینم لەژێر هەوری خەمبارانە
تۆ بەهەشتی عەشقت ئەوێ منیش وێرانەیە ماڵم
دەوازبێنە ئازادمکە با بۆ عەشقی تۆش نەناڵم
وێڵی ڕوخساری من مەبە شاعیرێکم بێ ناونیشان
جەستەم نوقمی تەنیاییەو وەرزی شیعرم گەڵاڕێزان
هەرگیز نەکەی عاشق ببی بەڕوخساری نادیارم
هەر چوار وەرزی من پاییزەو من هەمیشە بێ بەهارم
بڕۆ گوڵێ ، لە من دووربە ، با پشکۆی خەم نەتسوتێنێ
نەک ڕووباری نەهامەتیم لەگەڵ خۆیا بتفڕێنێ

# غەریبیتان

غەریبیتان فرمێسکێکەو لەچاو ئەکات ماڵئاوایی
بەدووریتـان ژوورەکەشم پڕ پڕ بووە لە تەنیایی
غەریبیتان تیشکی خۆری ناو ڕووبارەو ئەدات لە ڕووم
تەمـەن تاسەی ئێوە ئەکـات ، بەبێ ئێوە بەساڵاچـووم
قەدەر نەیهێشت بارانێک بین لەگەڵ یەکا گیان بسپێرین
وەکـو ڕێگـای منالیمان هـەنگـاو بۆ لای یەک بژمێرین
من درەختی پاییز نەبووم ، ئێوەش گەڵا لە من بڕۆن
کام ڕەشەبا ئێوەی فڕاند بەو زریانە وا خوول بخـۆن
لـە ئـاوێنـەی باخـێکـەوە نەمـانتـوانی چـرا هـەڵکـەین
وەک شەقامی دەمەومەغریب ، لە ڕووناکی خۆمان پڕکەین
چاومان لەڕێی چاوەڕوانی و دڵمان لەڕێی گەڕانەوە
وەک شەونمی بەر مانگەشەو بەدەم نیگای ئاسمانەوە
تەم و مژی غەریبیتان هەیوانەکەی داپۆشیوم
وەکـو گوڵی ناو گوڵدانێک لە شـەماڵی دابڕیوم

# ئەستێرە باران

تەرزەی خۆشەویستی تۆ ، خەمی دڵی وەراندم
لەشـەوی تەنیـایما ، چـرای بۆ داگیرساندم
بەهەشتی ئەم عەشـقەی تۆ ، پڕ لە ئاهـو ئاواتە
دیارە تەمەن بێ ئەوین ، وەک ڕێگەی خەراباتە
دەروازەی چاوەڕوانیم ، غەریبی تۆی لێ دیارە
دڵـم بـۆ دیـداری تـــۆ هـەمیشـە پـڕ ئـازارە
لەو ساتانەی لێم دووری ، ڕۆژی ڕوونم شەوگارە
بـەڵام کـاتێک ئـەتبینم ، پـاییـزم لا بـەهـارە
لافـاوی سـەرنجی تـۆ ، خـەمی دڵم لائەبا
وەکو شەماڵ دیدەنی باخێک وەنەوشە ئەکا
بێجگە لە خۆشەویستیت ، بێ سەمەرم ئەزیزم
وەکو گەڵای هـەڵوەریو هـاوسەفەری پاییزم

# ئاوێنەی خەمبار

تۆ کچێکی بەهاریی بووی ، منیش کوڕی گەڵاڕێزان
خۆ دەتزانی کەگوڵ نابێت بەهاودەمی وەرزی خەزان
ئەی بۆ هاتیت ، وەکو خۆری چاوبەنازی لای ئێوارە
کەدەتزانی لەسەر کۆچی و ئۆقرە ناگری لەم هەوارە
تۆ لەخەونی منا نەبوویت ، چۆن هاتیتە ناو چاومەوە
وەکو گڕی شەرابی سوور ، ڕژایتە ناو هەناومەوە
بۆ کوێت بەرم ، کۆشکی بەرزم لە ناو لەپی دەستمدایە
ئەو ڕۆژانەی کەمن هەمن ، زۆرجار خۆریان لێ هەڵنایە
من پەنجەرەی ژوورەکەشم باوەش بۆ (با) ناکاتەوە
هەرتەنیایی دەستم دەگرێ‌و بەرەو لای خۆی دەمباتەوە
دڵم وەکو ئاوێنەیەک تەمێکی لێڵ داپپۆشیوە
عومرم وەکو تاکە دارێک تا دوا گەڵای هەڵوەریوە

# گەڕانەوە

گەر ئەمجارە گەڕایتەوە لەگەڵ باران نم نم وەرە
(با) ی سەرشێتی تێڕوانینم بۆ شۆڕەبی پرچت بەرە
لە پاییزی چارەنوسا گەڵایەکم بێ ناونیشان
ئەستێرەی گریاوی منە ، بۆت ئەڕوانێ شەودرەنگان
دەوەرە با وەک باوبۆران سۆزی دڵمان بۆ یەک بەرین
لە لێواری دەریای عەشقا با هەمیشە بۆ یەک بژین
ئەم سەفەرە گوڵێک بێنەو وەکو بەهار دیدارمکە
بە گوڵاوی خۆشەویستیت هەناسەیەک تیمارمکە
لەو ساتەوەی لە تۆ دوورم ڕۆژی ڕوونم شەوی تارە
وا هەمیشە لەبەر تۆیە وەرزی عومرم بێ بەهارە
ئێستاش تەنیا هەتاو ئاسا چاو ئەگرێم تا ئێوارە
بێ تۆ شەویش ئارام ناگرم کەپری خەوم هەر بێدارە

# شنەی عەشق

واتئەزانی کە جێت هێشتم ئیتر ئەوین ئەتوێتەوە
باخی دڵم تینووی ئەبێ و وشک ئەکاو ئەبڕێتەوە
واتێنەگەی ، لەپاش کۆچت کاردانەوەم هەر گریانە
دواهەناسەش لە دەروونما بۆ سەرنجت وەک زریانە
نا باوانم خۆسەویستی خوێنبەرێکەو لە دڵمایە
ئاودامانی عەشقی پاکم ئاوێتەیەو لەگەڵمایە
وانەزانی وەکو جاران بۆ جێژوانت پەرێشان بم
لە ناخەوە بمهەێنێ وەک خەڵوەتی دەروێشان بم
هەگیز ناڵێم تۆ ئەوینی کازیوەی بەر بەیانم بووی
ئەورۆژانەش بژار ئەکەم کە هاودەمی ژیانم بووی
کە مردیشم سۆزی عەشقم وەکو باران ئەکا شەستە
لە گشت کوچەو کۆڵانێکا پڕ ئاوازەو ئەڵێ بەستە

# دواخۆزگە

خۆزگە تەنیا هەناسەیەک وەکو جاران ئەگەشتم پێت
تا بزانی کە ڕێگاکەم بۆنی غەریبی تۆی لێ دێت
وانەزانی ئەوەی کە ڕۆی بەئاسانی بڕایەوە
پشکۆی دووریت، ئەوەندەی تر، یادەکانمی گڕدایەوە
لەهەر لایەک گوزەر ئەکەم هەر ناوی تۆ دێتە بەر گوێم
لە بەر دووریت کەس نابینم ، بەبێ ئاگا هەنگاو ئەنێم
لە ئاوێنەی خەیاڵمدا تۆ ئەو ڕەنگەی کە لە چاومای
گەر بەڕاستیش تۆ نەبینم هەموو شەوێک تۆ لەخەومای
تەماشاکە دەنگی شیعر و هاواریش کش و ماتە
چونکە تینووی دیدارێکن ، بەڵام ڕێگەم بێ ساباتە
لەگەڵ هەموو چرکەیەکدا ، کزەی ڕۆحم ئەنێرمە لات
لە پاییزیش گەڵای عومرم گەر هەڵوەری دێتە بەر پات

# گێژاوی عەشق

دڵەی شێتم بڕوا مەکە بە دڵداری و سروەی ئەوین
خۆت مەدەرە بەر گێژاوی خۆشەویستی و ژان و گرین
حەزی وێڵت بەکەس مەدە لە سادەیی خۆت مەڕوانە
لە دەروازەی هەر دڵێک بەیت ، ئەمڕۆ بەشت دڵشکانە
ئەو پەیمانەی تۆ ئەینۆشی ، تۆزلێنیشتووی خاک وخۆڵە
دڵێک بۆ تۆ نەسووتاوە بۆیە ماڵت ساردو چۆڵە
نەکەی خەمت بئاڵێنی بەسەر ژانی بێداریما
سەفای خۆشی بڕەوێنی لەگەڵ هەوری بێزاریما
بەئاگری پەنهانی خۆت خوێنی جەستەم مەسوتێنە
لە ژێر پێ هەنگاوی زەمەن بە ئارامبەو مەناڵێنە
ئیتر بەسە دڵەی شکاو بەختی خۆتە بۆ جودایی
لە خەرمانی هەنسکی تۆ هەر با ئەیبا بەخۆڕایی

## هاوسەفەر

نـەمزانی بـۆ تەنیـایم ئەبیت بە فرمێسک و ژان
لە چاوما بەجێم دێڵی و ڕێ ئەگری بێ ناونیشان
بۆ هەنسـکی بەسـۆزم ، نەبویتە هـاوسـەفـەرم
نەبوویت بە ئەستێرەیەک ، منیش بتدەم لەسەرم
وەکـو بـەفـر هـاتیت و لـە نـاخـما تـووایتەوە
شیرین دەستم بۆ بردیت ، تاڵی بووی نەخورایتەوە
وەکو بـاران، ڕژایتە، نـاو پشـکۆی نـاخ و هـەسـتم
بادەی ئەم عەشقەم نۆشی ، بۆیە لای تۆ بەدمەستم
چەخماخەو بروسـکەی تۆ ، دنیای بۆ ڕووناک کردم
بەڵام چیبکەم، بە تیشکی، ساتێک ڕووناکیت مردم
وەک ڕۆژی تەم و خـومار ژینت کرد بەم خـومارە
هەرچی رابوورد بەجارێ وەک ڕەنجی من خەسارە
تەنیا هەنسـکی حەزین دواسـەرنجی ئەشـکانە
ئێستا لە گۆشەی دڵتا کێ‌ی تر وەک من میوانە؟

# دووری و غوربەت

هەر ئەڕۆم و وەک شەو و ڕۆژ بەڕێی خۆما دێمەوە
دوور لە تاسەی یادی کۆنی یارانم ئەتلێمەوە
وەکو کزەی ساردی نەسیم ڕێ ئەبڕم بەبێ وچان
هاواریشم بێنەوایە بۆ شەوانی پڕ لەژان
بۆ گوڵ ژیام کەچی وەرزم هەر سەرەتای پاییزە
ڕێگەی چۆڵم دوور لە دەنگی هاوارانی ئازیزە
بۆ کوێ بڕۆم دڵم وەکو کۆترێکی لانەوازە
چاوەڕوانیم باڵداریکە تا ئێواران بێ نازە
بە دڵ ویستم لە نێو کۆڕی هاویارانم دانیشم
ئیتر بەس بێ فرمێسکی ئاڵ بۆ غەریبی هەڵڕێژم

# شەوانی سیاپۆش

لە ئێوارەی ئەنفالێکا هـاتن تیشکی هـەتاویان کوشت
پەڕی گوڵیان دەسکەنە کرد ، لە بیابانا هەڵیان ئەڕشت
ڕووبار نەما دیلی نەکەن ، ئاوهەڵدێری نەسوتێنن
چرا نەما لە نـاو دێیا گڕو شـەوقی نەخـنکێنن
قەنارەکان، بۆ ئاوازی هـەناسەی قوڵ ئەترسێنن
هەڵپەڕینی تەرزە لە خاک بەتەزیوی ئەخەوێنن
خامۆش نابێ دوا سـەرنجی ئەستێرەی سەر کاروانی دوور
باڵای شاخم بورکان ئەگرێ ، پەیام دێنێ گوڵاڵەی سوور
کە دەفتەری وڵاتی خۆر، مێژووی ئاگر سـەرەتا بێت
هیلاکی خاک بۆ هەنگاوی ئاوارەکان بێ هاوتا بێت
سیمای چاوی دایکی وڵات فرمێسکی سوور ببارێنێ
چـۆن قەنـارە ، سـیمای مەرگ ، بە ملوانکە ئەناسـێنێ
هـەڵۆکانم دەسـەرکەون بە گەردنی لوتکەی شاخا
با داگیرسێ ئەو شۆڕشەی کە مەشخەڵی وا لە ناخا
بـا تـارمایی دوژمنـانی وڵاتەکەم سـەرەو لێژ بێ
نەبا دایکی شیرینیشم دڵی مشتێک خۆڵە مێش بێ

# ناکام

پەشیمانم ، لەوەی وتم ،کزەی ڕۆحم ئەبەخشم پێت
خۆشەویستیت بارەشێک بوو ، گوڵمی وەران کەوتە بەر پێت
پێت نەوتم بۆچی ئەڕۆی ، کێ پارسەنگم بۆ تۆ ئەدات
لە هاواری منا ون بووی بۆیە چرپەت لێوە نەهات
با تابلۆیەک جوانیت هەبێ ، لام وەک نەخشی سەر ئاو وایە
دەستە بالای گوڵەباخ بیت ، تازە بۆنت بۆ من نایە
با کیشوەرێک لە شەونم بیت وەک سەرابێک تۆ ئەبینم
بۆ لەمەودوا وەکو جاران لە باسی تۆ ڕانامێنم
چۆن ئەتوانی لەگەڵ مندا شەڕی عەشق بەرپا بکەی
خۆتۆ ئێستاش لەسەر ڕێدا کە ئەمبینی سەر دائەخەی
لەویژدانی خۆت بپرسە بۆ لە ئاستم شەرمەزاری
بێوەفاییت وەلامێکە تەنیا هەر خۆت تاوانیاری

## پشکۆی ئەوین

دەبمبەخشە، کەنەمتوانی، چرای عەشقت داگیرسێنم
لەڕێی هەموو هەنگاوێکتا ،گوڵی هیوات بۆ بچێنم
گوڵم نەکەی بە نیگــای پڕ ، دڵی مـاتی من بکێڵی
چونکە خونچەی سەرنجیشت ، بە وەریوی بەجێدێڵی
نیگای وێڵت ، لە من ببڕە ، مەمخە دەریای خەم و پەستی
نەکەی حەزت ببارێنی بەســەر پشکۆی خۆشــەویستی
خۆری چاوت پرشنگ ئەدا ، دیارە تاسەی عەشــقی پێیە
چی شک ئەبەی لە دەرونما تا شەپۆل بەی بۆ ئەم ڕێیە
ورد بڕوانی ، ئاشکرایە ، سـیمای چاوم ئەشک ڕێژە
تۆش ئەم حەزەت بتاسێنەو لەناو دڵی خۆت بینێژە
ئەی شاگوڵم هێندەی مەجنون ، شەیدای لەیل بوم لەکاتی خۆی
بەڵام لەیلی ئەم شـــارەی من تەنیا خشـــڵی گرتە ئەســـتۆی
من ئەترسم تۆش وەکو ئەو ڕێژنەی عەشقت سامالٚ بێنی
ئەشــێ هــەوری بێ ســامـانم ئـەوینی تـۆش بـڕەوێنــێ
نا بـاوانم ، لەسەر چـڵی نەداری من ئۆقــرە ناگری
بێگومانم لەبالٚ ئەدەی لەماڵی من لەنگەر ناگری

# بێدەنگی شار

شار خامۆشە، کش وماتە، کۆڵان کەسی لێوە نایە
تەنیا دڵی نیشتمانە پڕ لە هاژەی ڕەشەبایە
کەی پەیامی بەهار وابوو گوڵاڵەی سوور هەڵوەرێنێ
بۆ سەرچۆپی ئەم نەورۆزە نێرگز لەخاک بتۆرێنێ
هێشتا وادەی وەرین نەبوو چرۆی دارو دەوەن سووتا
وەکو پاییز پێشوازی گوڵ بۆ پەپوولە بوو بەسارا
کە هەتاویان لێ ون کردم ، نابینا بووم بەو سێبەرە
لەگەڵ جەستەی گەلای وەریو بێ نازکەوتین لەو دەڤەرە
لەژێر پەردەی تەم و مژا ڕۆح گەیشتە تاقی ئاسمان
هەناسەشم سەرەڕۆ بوو بۆ ئاهێکی پڕ بە ویژدان
هێلانەی مەل تابوتێک بوو بارەش ئەیبرد بۆ ئارامگا
هەنگاوەکان بێ لانە بوون پەشێوابوون لەتاو ڕێگا
هێز ئالوودەی مەینەتی بوو بەبێ ئارام خەوی لێکەوت
ئەژنۆی شکاو بەبێهوودە لەنیوەی ڕێ لە پێ ئەکەوت
چەم غوربەتی لێنیشتبوو سەری هەڵگرت وەک ئێوارە
خۆرەتاویش بێ کەس و کار زەرد هەڵگەڕا لەو هەوارە

# کزەی هەناسە

بۆچی نایەی ، پڕ سەرنجم ، هاودەمی ئەوینم بی
لـەڕۆژانی تەنیـایمـا ، هـاوسـەفـەری ژینم بی
چـاوەڕوانی نیگای تۆمـە ، تـا سـپێدە دەرکەوێ
لەبەر تیشکی چاوەکانتە ، ئەستێرەشم خۆشئەوێ
گەرچی جوانیت وەک بووکی گولاڵەی جوانی بەهارە
دڵ بـەزامی خـەمی تـۆیـە بێدەوایـەو بیمـارە
سەرم خستە نێو کۆشی خەم تا یادێک بکەمەوە
گۆشـەگیریی و تەنیـای بۆ ماڵی خـەم بەرمەوە
وەرە تـاوێ بڕوانــە ، سـیمای شـێواوم ببینـە
هەر خۆت گوڵی سەبووری لەخاکی دڵما بچێنە
وەک زوڵفی تۆ ، بەدەم باوە دێم و دەچم بێ ئارام
پـەشـێواو و لانەوازم وەرە ئەی خـۆری دنیام

# دوا سەرنج

بەڕووی مـانگت ، نــاڕوانیتە شـەوانێکی سـیاپۆشـم
هەتا خۆری چاوت دادێ ، دوا پەیمانەی خەم ئەنۆشم
تۆ لەڕوئیاو خـەیاڵمدا ، هـەمیشە وای لەبەر چـاوم
ئەی نازانی من بەبێ تۆ وەک مۆمی دانەگیرساوم
بە دوو دەستی زەریفانە ، لیوانێک پڕ عەشق بێنە
لەنێو ئەهلی خەمبارندا ، سۆزی وەرەو دەرم بێنە
شایەد ڕۆژێ لەخۆت پرسی ، ئەم خەڵوەتە لەپای چییە
تا ناسەری لای تۆ ئەبم من هـەر ڕێگـام تەنیـاییە
لەکـەناری دەریای ژینا لە بێکەسـی بێکەسـترم
خۆمن ئەهلی مەستانە نیم ، لە بادەنۆشان مەسترم

# هەنگاو

کەیەکەمجار هاتی بۆ لام ، هەنگاوێت ئەکرد بەدوان
بەڵام ئێستا بەهەنگاوێ ڕایئەماڵی یادگارەکان
بەرز فڕیت ، بەڵام دیارە ، لەئاسمانیش پەشیمانی
بۆیە ئێستەش وێڵی بەدوام ، تا هەواڵی من بزانی
هەرچی ڕۆژێک سایەی باڵات ، وەک ئێوارە بەجێی هێشتی
ئەوسا ئەتوانی جێم بێڵی ، وەک فرمێسکێک کە بۆم ڕشتی
دوا یادگاری ئەم ئەوینە هەناسەیەو لەگەڵتایە
بۆ کوێ بڕۆی دێتە ڕێگەت وەک شنەی (با) بێ سیمایە
بڕۆ خاکی شوێن پێکەشت لەگەڵ خۆتا ڕابماڵە
سکاڵای من بێدەنگییە چونکە عەشقی تۆ بەتاڵە
ئیتر هەرگیز ڕێی جارانم بەڕێگەی تۆ ناگاتەوە
نەک سەرنجم، بگرە دڵیش، دەرگا لە تۆ ناکاتەوە

# بێ پەنا

ئەگەر تۆ بێ‌ی، ئیتر هەرگیز، چـاوەڕوانی بەهار ناکەم
تا دوانەفەس ، بەمردنیش ، هەست بە بوونی ئازار ناکەم
با لەکوچـەی چـاوەڕوانی بێمە دنیای یەکبوونەوە
خوا ئەزانێت خۆشیم نییە بەدەست دڵەی زەبوونەوە
ئەوسا ژینم پڕ سەفایە و خەمم لەکۆڵ ئەبێتەوە
دەرگای هیوام لەبەهەشتی ئاسمانێکا ئەکرێتەوە
ئەم گۆشەیەی کە ئێستاکە بۆتە ژووری خەمەکانم
مەگەر هەر تۆ فریام کەوی دەستم بگری بۆ ژیانم
ئەی هەناسەی ناو دەروونم لەم غوربەتە جێم مەهێڵە
بـێ تـۆ دڵم بـێ پەنـایــەو ڕێبوارێکی تــەنیـاو وێڵە
بەزمانی بەستراویشم تەنیـا بۆ ناخـی خـۆم ئەدوێم
لە دوا ڕێگەی چاوەڕوانی بۆ ماڵی خەم هەنگاو ئەنێم

# ئاهوئاوات

ئاهوئاواتم هەر تۆ بووی . . گوڵم بۆچی نامدوێنی
سەفای خۆشبەختیم نەما، گەر تۆ خەندەم بۆ بێنی
لە میهرەبانی جـوانیتـا ، ئەتۆ نەغمـەی ئەوینی
ئەشێ بەدبەختی خۆم بێ بۆ من وەرزی ئەسرینی
هەناسـەی شیرینم . . نەوگوڵی ئەوینم
بەسەکزەی جودایی . . تاسەی عەشقی تەنیایی
لەئاگردانی دەروونما ، ناخم کورەی بەستەمە
تینووی کانیلەی ڕێتم ، میهری دڵ و جەستەمە
لەخۆرەتاوی نیگای تۆ ، پەردەی تەمی پاییزە
نێرگز سەرچۆپی ناگرێ ، بەهار دیلی ئازیزە
گریانی شەوانە . . ئاوازی بارانە
خەندەو خۆشی تۆراوە ، بەهار سیمای گۆڕاوە

# سەفەری خەم

ئەمشەو دڵم ئەناڵێنێ لە ئارانی هەوارێکا
کۆترێکەو هەڵکورماوە لەقەد پاڵی نسارێکا
فرمێسکی چاو بەخوڕ دێت و لەگەڵ خەما ڕێگا ئەگرێ
چراکەشم تروسکەی دێ ، هەناوی خۆی بەگڕ ئەبڕێ
هاوڕێی گیانیم، خەمی شەوم ، وەرە دڵم پڕکەرەوە
دواهەناسەش بۆ ناو گەرووم پڕ بەتاسە شۆڕ کەرەوە
ئێستاش خەمە کەدڵسۆز بێ‌و خۆی لەجەستەم بئاڵێنێ
لە مەنزڵگای دوا هەوارم کۆڕی شیعر بسازێنێ
چۆن لە ماڵی پڕ هەنسکا دەست بەرداری خەمی شەوبم
کەمن پشکۆی گڕی عەشقی خۆشەویستی دەستی ئەو بم
لەگەڵ ژانی دەم پەژارە ئاهی شەوم بێ کۆتایە
خەیاڵێکەو مەرگەساتە تا چاوبڕکا لە سۆتایە
لەگەڵ دڵی ئەم شەوەدا بۆ تۆ ئاخم هەڵکێشاوە
بۆ ئامێزی کسپەو ناسۆر فرمێسکیشم بەلێشاوە
ئۆخەی ناکەم بە گێژاوی گەردەلوولی خاکی خەیاڵ
ناچار ئەبم ئارام بگرم تا لێم هەڵکا شنەی شەماڵ

# گۆشەگیر

ئەوا دیسان زەماوەنە دڵی منیش دەریای مەنگە
تەنیا منم ،گۆشەگیرم ، دوور لە خۆشی ئەم ئاهەنگە
ڕەشبەڵەکە وەک ملوانکە هەڵئەپەڕن کوڕ و کچان
زۆر بەجوانی ئەینەخشێنن دەست بەرنادەن بەبێ وچان
ئارام ناگرم لەم گۆشەیە چونکە بێ تۆ لام زیندانە
گشت ئاوازێک بۆ دەروونم کاردانەوەی بەگریانە
ناچار منیش مەلی نیگام بۆ باڵای تۆ ئەخولێتەوە
تۆ لێرەنیت منیش دڵم بەهیچ کەسێک ناکرێتەوە
زۆر ئەبینم لەم ئاهەنگە پڕسەنجم خۆ ئەنوێنن
هەرچەن ئەکەم لەبەر چاوما شێوەیەکی تۆ نانوێنن
لەتۆ زیاتر کەس شک نابەم مەیلی عەشقم بجوڵێنێ
وەک خۆت ئاسا تەرزەی سەرنج بە ڕوخسارما ببارێنێ

# دیاری

چی بنێرم ، بەدیاری بۆت،کەوەک خۆت بێگەرد و جوان بێ
تەنیـا دڵم بـەدی ئـەکـەم هـەتـا مردن لات میـوان بێ
ڕاستە من بەو دڵە ئەژیم ئەیدەم بەتۆ وەک ئاوێنە
چی بێ لە دڵ شیرینتر بێت، تۆش لە دڵتا بیخەوێنە
لە دوورەوە چـاوم لەگەڵ سـەرنجـی تۆ ئاوێزانە
دوو ماناڵی دەم بەخەندەن بۆ یەک ئەدوێن ئازیزانە
کە ئەگەیتە بەر دەروازەی ماڵی گلێنەی چـاوانم
منیش بەسەرنجی تینووم بۆ خۆری چاوت ئەڕوانم
بەڵام چیبکەم لە دوورەوە پرشەی نیگات ئەمسووتێنێ
هەرچی وشەی ئەوین هەیە، لە شەرما خـۆی ئەتورێنێ
ناچار منیش ، بێدەنگ ئەبم، تا تۆ حەرفێک بدرکێنی
هەتا لە جێژوانی تارم ، چرای عەشقێک داگیرسێنی

# هەڵوەرین

وا پاییزەو گەڵای زەردی درەختەکان هەڵوەریون
باڵندەکان لە ئاسمانا تەمێکی لێڵ دایپۆشیون
جەستەی منیش خولیای تۆیە لەم ڕێگایە غەمەنگیزە
هەنگاویشم بێ لانەیە لە بەر گەڵای ئەم پاییزە
ئەی وەرزی تەم بەهەناسەت وشک ئەکەی گوڵزارەکان
لێزمە ئەکەی شەکەت نابی وەک فرمێسکی دڵدارەکان
زریانی خەم تێکەڵاوی بارانی گریانم ئەکەی
گەڵای جوانیش ئەوەرێنی لەبەهەشتی داری ئەخەی
ئەی وەرزی جوان، بابسوتێ‌ی بە ژیلەمۆی وەرزی خەزان
خەم مەپۆشەو شەکەت مەبە هەتا ماوە گەڵارێزان
چونکە منیش هەر وەکو تۆ لە ئەوینم هەڵوەریوم
لە بەهاری ڕابردووما ، لە سایەی تۆ هەڵپەڕیوم

بۆ کوێ ئەڕۆن کە ئەزانن تەم و مژ وا لەڕێتانە
دوا سەفەرە لە هـەڵەبجە، کە زریانەو گۆڕستانە
دیارە وەرزی گەڵەکۆچەو شارەزووری گرتۆتەوە
نیشتمانم خەم ئەنوێنێ، لەجیهانیان شاردۆتەوە
ئـای لەم وەرزی دابڕانە، لـە هـەر چـوارلا هـەر وەرینە
دەی ڕەشەبای دواهەناسەو فرمێسک باڵای مەرگ ببینە
بـە بێدەنگی لە دواسـاتی ماڵئـاوایی ڕاوەسـتاوم
کە ئەبینم گوڵ ئەوری و باڕەش ئەیبا لەبەر چاوم
دیارە ئەمڕۆ هەڵمژینی هەناسەتان بۆنی شارە
ئەستێرەی کاروانی ئێوە چراخانی شەوی تارە
چۆن ئەتوانن بەڕۆحی پاک هەڵەبجەکەم ئەگرنە کۆڵ
فریاکەون کانی عاشقان دەروونی بوو بەمشتێ خـۆڵ

# داب‌ڕان

کزەی عەشقی منە وەرزی دووری ئەوین یادەکەم
وەکو شـــەماڵ بۆ گەڵایەک هەمیشـە هانا دەبەم
خـەمی کۆچـی تـۆیە گـوڵم دڵی شێوانم بـەجـاری
کۆچەرێکی ڕێی ئەوین بووم بۆ سۆزێکی پڕ ئازاری
تۆ پێت وتم باخی عەشقم پڕ سێبەری ڕێگەی تۆیە
هەرچی ئاهێک هەڵدەکێشم یەکەیەکە خۆزگەی تۆیە
ئەی ئێستاکە ئاهت بۆ کرد بەهاودەمی هەناسەی من
خۆزگەت بۆکرد بەگوڵێکی زەردو تینوی دواکاسەی من
تۆ سەرەتا نم نم هاتی کەچی ئێستە ئەمسووتێنی
بۆ ســـەمـەری چاوەڕوانیم باخی هیوام ئەوەرێنی
چـۆن بتوانم بێ تۆ بژیم سەفای دڵم وێرانەیە
ئەویش چەرخی دەورو دەستی دابڕانی زەمانەیە

# بێهووده

وامئەزانی، کەجێم بێڵی، کەشتی ڕێگەت لەنگەر ناگری
بڕوام نەکرد کە زریانی ئاهی دڵم ڕێت پێ بگری
بەسەر مندا شەپۆلت برد هەور ئاسا چویتە ئاسمان
بەڵام ئێستە بەلێزمەوە دێیتە خواری وەکو باران
ئێستا چرای عەشق و هیوام خامۆش بووە بەدەستی تۆ
هەستی شیعرم بێهوودەیە لەیادێکی سەرمەستی تۆ
خونچەم وەری و دڵم شکاو هێلانەشم لێشێواوە
گەڕانەوەش دادت نادات چون بەفری عەشقم تواوە
ئاوێنەی دڵ وا شکاوە وێنەی تۆشی ون کردووە
تۆ بزانە چ دەردێکت بەم ئەوینەی من بردووە
ئیتر بڕۆ بیر لە سایەی داری عەشقم مەکەرەوە
ڕێژنەی کۆچت بۆ کێ دایکرد هەر بۆ ئەوی ببەرەوە

# هەراسان

هەراسانم لەم شەقامە هەرچەن تاکەو گوڵی شارە
هەتا دوێنێ جێژوانمان بوو بەڵام ئێستە جێی نەیارە
ئەی شەقامی دەم بەگوڵم بۆچی ڕێگەت لەسەر پشتە
گەر دوو هاوسەر بێن و بڕۆن لای تۆ ئەبن بەفریشتە
ئەی نازانی ئەوخاتوونەی کەهات پێی نایە سەر پێڵوت
سەردەمێک بوو، نازەکانی بەمن دابوو لە خاکی ڕووت
وا ئێستاکەش هەنگاوەکەی چاوی ڕەشی تۆی شاردەوە
لەبیرت چوو پیاڵەی عەشقی پڕ تاسەمی ئەخواردەوە
کە زانی عەشقی بێگەردم بێ تەلایەو بێگەوهەرە
لەباڵی دا و باکی نەبوو لە کۆچی خۆی بێ خەبەرە
ئەی شەقامی سەرلێشێواو باڵت لە ڕێیان هەڵکێشە
گەروەفای بۆ من نەبووبێ شوێن پێی بۆتۆش دڕک و ئێشە

# ئەشک

ئەی تەنیایی، چەن شیرینی، بۆ تاڵی و سەختی ژیانم
گەر تۆم هەبێ، کەسم ناوێت، تۆی دڵسۆزی خەم و ژانم
وا بێکەس و بێ میوانم دایمە دەرگام داخراوە
نوسراوی ناو لەپی دەستم تەعبیرێکی ئاڵۆزاوە
هەور بەسەر سەرما ئەگری و نمنم ئەشکم بۆ ئەرێژێ
پاییز لە سێبەری خۆیا جەستەی گەڵام بۆ ئەنێژێ
هاوسەفەرم سایەی خۆمە کە خۆر نەبێ ئەویش نایە
جاربەجارێ دڵخۆش ئەبم کە ئەبینم هاورێم بایە
کە ئاشنای تەنیایی بووم قەدری نەبوو لام یەکەمجار
هەتا رۆژێ زۆر خەمبار بووم لەگەڵ ئەوا چوومە کەنار
ئەوسا زانیم کە تەنیایی دانیشگایە بۆ دەروونم
بەرابردووی خۆما ئەچم دەرسی تازەی تیا ئەخوێنم

## هەرەسی ئەوین

هەرچەن لەشـاری بەهارام کەچـی شەماڵ گوڵ نادوێنێ
خۆشەویستی و عەشق و ئەوین لەم هەوارە هەرەس دێنێ
لەکۆڵانی بەربەستراوا نیگاو سەرنج لەیەک ئەکەن
ئاهو ئاوات دەنگیان نایە تا لە قاپی ئاسمان بدەن
وا ڕەشماڵی خێڵی ئەوین لەبەر هاژەی ڕەشەبایە
چرای عەشق و خۆشەویستی وا ئەخنکێ و بێ هانایە
وەک چۆن باخێک سەردائەنێ بۆ پاییزێک بەکینەوە
عاشق فرمێسک ئەوەرێنێ بەتابووتی ئەوینەوە
مامەی کاروانی خەمباران لەنیگاتا ئاور دوورە
کە دائەکا ڕێژنەی گریان لەچاوانتا بێ سنوورە
بەدوا وشەی پڕ هەنسکی پەشیمانی وماڵئاوایی
سۆزێکی بێ پایان خۆتی کە ئەیبەخشی دڵنەوایی

# دڵنەوایی

کە ئێواران تەنیا ئەبم خەیاڵی تۆ ئەمباتەوە
دەنگی سۆز و پڕ ئاوازت لەناخما دەنگ ئەداتەوە
وەکودەریا، شەپۆل شەپۆل، تاڤگەی جەستەم بۆلای تۆ دێ
بەڵام چیبکەم هەنگاو دژی حەز و هیوام ڕێگا ئەبڕێ
گەرچی بەرەو گۆشەی تارو ناهەمواری ئەڕۆمەوە
بەڵام دڵ و سەرنج ئەڕۆن لەگەڵ خۆمیان نابەمەوە
ئەڵێن چاو سرکە ناگیرێ بەڵام ئەشکم ددستەمۆیە
پێ هەنگاوم بەرەوماڵەو کزەی دڵم بۆ لای تۆیە
ئەم ئێوارە پەشیمانە ماڵئاوایی ئەکاتەوە
تا سپێدەی ڕون دێتەوە خەمێکی تر دەخاتەوە
لەژێر چەتری ئەم شەوگارە خەم ئەنۆشم بەئەسپایی
بێجگە لەتۆ کەس شک نابەم بمداتەوە دڵنەوایی

# بێ سۆراغ

بێ سۆراغ نیم، ئەگەر ڕۆژێک، کەخۆم ون کرد لەبەر چاوتان
لەخـەونیشـا لەگەڵ ئێوەم، لە ناو دڵمـان ئەی هـاوڕێیان
باوەڕ بکەن کەس نـاتوانێ یـادی ئێوەم لێ ون بکا
هیچ خونچەیەک ڕەنگی گوڵی ئەم هەوارە لەمن بکا
لەگەڵ هەموو کزەبایەک ئێوارانم بیر دێتەوە
دەنگی ئێوە لەناخمدا هەمیشە ئەزرەنگێتەوە
با دارتێلی شەقامەکان دوا یادگاری وەستانم بێ
فرمێسکەبارانی ئاسمان هەگبەیەکی سەرشانم بێ
دڵنیـابن بەبـێ ئێوە ڕێبـوارێکـم بێ نـاونیشـان
خەڵوەتێکم لەبێدەنگی و شارێکم لە خەم و گریان
بێ تۆ ناژیم شاری شیعر و دوا گۆرانی و دوا ئاوازم
بێگومانبە لەهەرکوێ بم من هەمیشە پێت ئەنازم

# بیرەوەری

ئەگەر هات و بیرت کردم ، تامەزرۆ بووی کە بمبینی
کە لێت دوور بووم، نەکەی بچی ، دڕکی ئازار بچەقێنی
بڕۆ لـەگەڵ یادەکـانما دابنیشـە تـا دێمە لات
یادگاریمان لەبن نایە ، بەشی هەتا مردن ئەکات
لەژێر سایەی پەڵە هەورێ سۆمای چاومان بەیەک بەخشی
لـەکـاتێکی نـادیـارا بـادەی عەشـقی یەکـمان نۆشـی
حەزم نەکرد دواهەڵبەست و گۆرانی من، خەماوی بێ
خەتی نوێژگەی ناوچەوانم نوسراوێکی تەماوی بێ
لە دووری تۆ وەک ئاگری بەر ڕەشـەبا بێ ئارامم
لەلای خەڵکیش وائەزانن من هەمیشە بێ کەلامم
بێهوودەیە ئەزیزەکەم هەرچەن ئەکەم ناگەم بەتۆ
بەسووتانی مۆمی عومرم واتەمەنیش ڕۆی بەفیڕۆ

# بەستەی غوربەت

ئەوا ئەڕۆم ، وشکە ڕێگەی ، دورەولآت ئەگرمەبەر
بەناچاری خۆم ئەدەمە بەر بارانی ، هەوری قەدەر
ئەمن هەرگیز خواستم نەبوو ساتەوەختم تەنیایی بێ
گۆشەگیر بم لەکەسوکار دواتەمەنم جودایی بێ
ئەڕۆم چیتر بەستەی غوربەت بەناکامی ئەڵێمەوە
وەکو گەڵای زەردی پاییز بەدەم باوە ئەخولێمەوە
خۆ نازانم ڕێی غەریبی دواهەنگاوم بۆ کوێ ئەبا
زەردەخەنەش بێهوودەیە لەدەروازەی مەینەت ئەدا
هەرچەن لەناو ڕازی دڵما یادەکانم پەنا داوە
وەکو مەلی سەرلێشێواو دڵ ئارامی لێ بڕاوە
بۆ وڵاتم بۆ یارانم دواهەناسەم هەڵئەکێشم
لە ئارامگای دڵ و دەروون دواهەنسکی خۆم ئەنێژم

# ئەستێرە

ئەستێرەکەی شەوانی من ، بۆچی ون بووی لەبەر چاوم
وەختێ کشای لە ئاسمانا ، من لێرە سووتا هەناوم
من نازانم بۆ کوێ ڕۆشتی هاواریشت دەنگی نەبوو
توانەوەت پرشنگی دا گەڕانەوەت ڕەنگی نەبوو
خۆ من شەوان هاودەمێکی پڕ نیازی تریفەت بووم
عەشقی جوانی سیمای گەشی ئەم ڕوخسارە زەریفەت بوم
هەتا بڵێی خاکی چاوم لە سەرنجت تێراو نەبوو
لەئاسمانی پڕ ئەستێرە بۆ هیچ کامیان مەیلم نەچوو
تاسەی عەشقم لەتۆی دابوو بەلام بێهۆ خۆت لێم تۆران
بویتە فرمێسکی بلوريو خۆت لەگۆنای مانگ هەڵوەران
جێگەی داخە ، کە سبەی شەو، ئەستێرەی تر سەردەردێنێ
لەم ئاسمانە لە شوێنی تۆ ، بەتاسەوە خۆی ئەنوێنێ

## بەسە چیتر

بەسە چیتر لەپاش کۆچت مۆمی تەمەن مەتوێنەوە
بینای چاوم مەکە دەریاو ئەشکی گەشم مەڕژێنەوە
بێجگە لەتۆ کەس شک نابەم خەمی قوڵم وەدەربێنێ
لە دەروازەی شەوی تارم مۆمێکی نوێ داگیرسێنێ
تۆ نەهـاتی وەکو شەماڵ تێکەڵاوی هـەناسەم بی
لەتەمەنی هەڵوەریوم خونچە گوڵی سەر کاسەم بی
من تا ئەمرم خـۆشـەویستی بێ پایانم سەرەتایە
نەهەنگی ناو دەریای دڵت جیابوونەوەی لەکۆتایە
دەتۆش ئیتر پیاڵە لێکدەو بادەی تازە بخۆرەوە
منیش لێرە ئەناڵێنم بەدەس خەم و ناسۆرەوە
وانەزانی کە دووری تۆ یادەکانت ئەباتەوە
هەتا بڕۆی زیاتر دڵم گڕو کڵپە ئەخاتەوە

# تێک شکان

ئای لەوڕۆژەی کەنەمزانی بە نیگای تۆ خۆم تێک شکان
لەڕێی بەلەمی ئاواتم خۆشیت لەمن کرد بە تۆفان
نەفرەت لەمن، کە سادەبووم ،خۆشەویستی تۆش ڕەهێڵە
بۆیە ئێستا شێوەم لای تۆ ، وەک نەخشی سەر گۆمی لێڵە
تۆ پێت وتم هەناسەکەم من ڕاستگۆی ناو ڕاستگۆیانم
هەتا ئەمرم تۆ شک ئەبەم وەکو ڕۆحم بۆ ژیانم
کەمردیشم بەتەنیایی بۆ ئەستێرەی شەو مەڕوانە
ڕۆحم لەئاسمان ناسرەوێ لەگەڵ ڕۆحتا ئاوەڵدوانە
بەڵام ئەوەی کە تۆ وتت هەمووی ئەفسانەو خەیاڵ بوو
ئەو فرمێسکەی کەئەوەری تاسەی جادوی چاوی کاڵ بوو
ئێستا منم لە ئامێزی جیهانێکی پڕ ئازارا
لەسەرەڕێی نامۆ بوون و داستانێکی نادیارا

# ڕووان

بەئەسپایی چاوهەڵبێنە بۆ نیگایەک پەشێواوم
خۆشەویستی تۆ دەریایەو لەکەناریا ڕاوەستاوم
لەدوورەوە بۆت ئەڕوانم تۆ هەلاڵەو منیش باران
وەکو وەرزی دەمەو بەهار پڕ تەماشاین بۆ لێکئالاّن
من ولاّتی خۆشەویستیم هێندەی ئاسمان بێ سنوورە
بەچاوی تۆ چاو هەڵدێنم شەوانیشم پڕ لە نورە
خۆزگە جارێک بایەک ئەبووم تاوێ زوڵفت بژاکێنم
پەنجەم ئەکرد بەشانەیەک کەزیەکانتی پێ دابێنم
لێوت لێوی لێوانێکە تینووی ناخم بۆ ئەشکێنێ
تەماشایەک لای تۆوە بێ ڕۆح و جەستەم ئەتاسێنێ
وامەزانە وەک ئەستێرە لەدوورەوە بۆت ئەڕوانم
لەخەونیشا لەگەڵ تۆدام خەویش بەجێژوان ئەزانم

# هەناسەیەک

خۆشەویستیت ئاسمانێکە هەمیشە وا بەسەرمەوە
دەروازەی گشت سەرنجێکم بەیادی تۆ ئەکەمەوە
گەرچی دوورم بەلام شێوەت قەت ون نابێ لەبەر چاوم
ساتێک وشک نابێتەوە هەردوو دیدەی پڕ لە ئاوم
زۆر ئەترسام کە ڕۆژێ بێ لەچاوانتا خۆم نەبینم
بەبێکەسی مەودام نەبێ لەئازاری خەم و شینم
ئەم سەفەرە هێجگار سەختە چونکە لە تۆ دابڕاوم
ئاخۆ کەی بێ شاد ببمەوە بەسۆماکەی بینای چاوم
ئەگەر بڵێم خۆشەویستیت دەریایەکی بێ بەندەرە
بڕوابکە هەناسەکەم بێ تۆ خۆشی لام کەسەرە
ڕێگام کوچەی تەنیاییەو سەرم سەودای هەزار خەمە
چەن هەناسەی سارد هەڵکێشم بۆ یادی تۆ هێشتا کەمە

لەدوای کۆچت ئاوداماتی دەریای خەمی بێ بوارم
ماندووی ڕێگەی چاوەکانتم کۆچەرێکی بێ هەوارم
وەکو بەفر بەبێگەردی هاتم ئێستاش ئەتوێمەوە
گوڵم ئێستە شیرنترم لەگەڵ تاڵیش ئەخورێمەوە
پاش چی ئەڕۆی هێندەی باڵات بەفری عەشقم لێت باریوە
شەقام نەما جێژوان نەبێت، ئەم شارەشم لێت تەنیوە
سروەی عەشقم لێت ئاڵا بوو، تا باڵاکەت بشنێتەوە
بەڵام شەپۆلی دابڕان بۆ کەنارم دێنێتەوە
خامەی دەستم هەنسک ئەداو نۆ شیعرێکی ئەگرێنێ
لەدەست غوربەتی تۆ ناچار وشەکانی ئەشێوێنێ
لە کێشانەی سۆزو خەما دوامەبەستت کێشانەکە
فریاکەوە وەرزی حەز ڕۆی هاوسەری خۆت نیشانەکە

# سەرنج

ئێوارەیەو بەهێمنی وردە وردە ڕێگا ئەبڕی
لەگەڵ لەنجەی سەرەڕێگەت لەشەقامدا پەنا ئەگری
لەدوورەوە تیشکی چاوت ئەوینێکی خوڵقاندووە
بەرگی جوانی پڕ ئەندازەت بەساکاری نەخشاندووە
هەموو ڕۆژێ بەنیگایەک لەم شەقامە ئەمهەژێنی
خەندەی لێو و چاوی سەرنج جاربەجارێک ئەتۆرێنی
کەتێپەڕیت ناچارمنیش ئەم شەقامە بەجێدێڵم
بەچرکەیەک بێزار ئەبێ لەم بەهەشتە حەزی وێڵم
ئەی نازانی دڵەی کەیلم بۆ دیدارت ئەناڵێنێ
چاوەڕوانی دەرفەتێکە تا عەشقم پێت بناسێنێ
وانەزانی کە ناتوانم ئەم ئەوینە بخوڵقێنم
لەگەڵ لەنجەی سەرەڕێگەت ئەم پرسیارە بدرکێنم
چونکە چاوت هەتاوێکە لە ڕووی تارم هەڵدێتەوە
بۆیە منیش کە ئەتبینم وشەکانم ئەتوێتەوە

## ون بوون

کوا شەپۆلی عەشقی دەریات تەوژمی بۆ جەستەم ئەبرد
کوا ئەوخەمەی بۆمن ئەخوراو لە سینەتا کڵپەی ئەکرد
ئاخۆ ئێستا هەنگاوەکەت بەرەو کام حەز ڕێگا ئەبڕێ
لەدەریاچەی پڕ ئەوینت ڕوخساری من نوقوم ئەکرێ
من لەقاپی دڵی تۆم دا هەتا ترپەی هەناوت بم
تا لەدنیای خۆشەویستی دوانیگاری بەر چاوت بم
ئێستاش تاسەی دووریت بکەم بۆنی یادت شەپۆل دێنێ
گڕی عەشقت لەهەناوما ئاگردانێک ئەخوڵقێنێ
گوڵم مەڕۆ یادەکانم شەپۆلیان بۆ تۆ هێناوە
یادگارێکی پڕ تەمەنم لەسەر ڕێتا بەجێ ماوە
ئاخۆ ئێستا سیمای عەشقت بۆ تاسەی کێ ئەڕازێنی
بەفری نیگات بەهێمنی بۆ شێوەی کێ ئەبارێنی

# سلێمانی و چراخان

ئێوارەیەو گەشەی هەتاو ماڵئاوایی ئەکا لە شار
زەردەپەڕی دەمەومەغریب سەرهەڵئەگرێ لەشەوی تار
ئەستێرەکان دێنە دەریای ئاسمانێکی پان و بەرین
تریفەی مانگ شەپۆل ئەدا بەسروشتی جوان و نەخشین
سلێمانیش چراخانەو دوانیگاری تاسەی شەوە
شەقام وێڵی شەوەزەنگەو عاشقێکی شیرین خەوە
چیاکانیش بێ وەنەوزێ نیگابانی شار ئەکێشن
کوچەو کۆڵان بەهێمنی بەرگی تەنیایی ئەپۆشن
درەختەکان ئێشک ئەگرن بەسەر جەستەی شەقامی تار
شەماڵ دەستی گەلائەگرێ و بەیەک ئەگەن وەک دوودڵدار
کات درەنگەو سەرنج خەمی گەڕانەوەی دەم بەیانە
شەویش ئەڕواو عاشقێکی لانەواز و بێ جێژوانە
واسەحەرەو شیعری ماندوو لەم دیمەنە ئەتوێتەوە
چاوەڕوانی ئاسۆی ڕوونە بەمژدەوە هەڵبێتەوە
بانگی بەیان پەیامێکە بەشەو ئەڵێ ڕۆژهاتەوە
خۆر بەخەندەو پێکەنینی سڵاو لەشار ئەکاتەوە

# خۆزگە

خۆزگە کاتێ هاتی بۆ لام دەرگای دڵم داخستایە
بەدوا نیگاو خۆشەویستیت پێکەنینم بهاتایە
من نەمزانی وەک باڵندە تۆ گەرمیان و کوێستان ئەکەی
بەچوار وەرزم هۆگر نابی هەر ڕۆژێ بێ لەباڵ ئەدەی
بڕوام نەکرد ئەم عەشقەی تۆ ڕووبارێکی کۆچ لەبەر بێ
بەهارێکی بێ وەنەوشەو هاوینێکی بێ سەمەر بێ
خۆمن عاشقی پڕ شەونوێژی سەر بینایی چاوانت بووم
لەبەرماڵی تەنیایدا دەستەو دۆعای شەوانت بووم
سەردەمی زێڕ ئەوە نەبوو کە بەهەشتی ئەم دنیا بێ
تا سەرابی بیابانیش لەبەر چاوت وەک دەریا بێ
کە تۆ ڕۆشتی خونچەیەکت بەجێنەهێشت بۆ یادگاری
گوڵم بۆچی وەک با بردت بۆنی عەتری وەفاداری

# چاوەڕوانی

بۆ نەهاتی خۆ من عومری چاوەڕوانیم هەر بۆتۆیە
بێ تۆ دڵم ئۆقرە ناگرێ و مناڵێکی سەرەڕۆیە
وامئەزانی کە ئەمڕۆ دێی ئەم حەزەمان تێکەڵ ئەکەین
ناسۆری ئەم ماوەیەشمان بەدیدارێک لەناو ئەبەین
تاریک داهات منیش ئێستا بۆ یادێکت پەنا ئەبەم
لەگەرووما پیاڵەی خەمم بەهەنسکێک لەدڵ ئەدەم
هەر ئەڕۆم و ئەم مەغریبە لەتۆ دوورم ئەخاتەوە
هەستم کۆترێکی نازدارە لەشەقەی باڵ ئەداتەوە
هانا بەرم بۆ هەر گوڵێک یادێکی تۆ نیگابانە
پەنجەش بەرم بۆ هەر شیعرێ ئاودامانی خەم و ژانە
وشەکانیش بەبێدەنگی بۆ مەبەستم دێنە خوارێ
لەگەرووما قەتیسماون تەنیا بۆ تۆ دێنە زارێ
ئێستا ئەسرین ئەبارێنم دڵی ماتم لە تۆ زیزە
بەهارێکی بێ نێرگز و زریانێکی دەم پاییزە
هەرچەن سۆراغی تۆ ئەکەم من دڵنیام بێ سەمەرە
ڕوو ئەکەمە هەر جێگەیەک بۆ ئەم دڵە هەر کەسەرە

# هەوارێک لە ئاگر

کەی بارانێک بۆ ئاگری ئەم هەوارەی من دائەکا
مۆمی وڵات هەمووی سووتا کێ چرای هیوا هەڵئەکا
ئەستێرەیەک خامۆش کراو لە ڕەشماڵی شەویان ئاڵان
تفەنگ هات و خەوی زڕان شیرین خەوی برد بەتاڵان
ئاوازەکان وائەگرین و قەڵەمەکان دیل کراون
هەڵبەستەکان لەترسانا هەمووی بەقوڕ سواغ دراون
پەپوولەکان لە گوڵزاران کەچی گوڵیان لێ وەریوە
ئەمە خەمێکی زۆر سەختە کێ لە خەما خۆشی دیوە
کوڕان ئەڕۆن دایکی وڵات بەبێکەسی بەجێدێڵن
کچۆڵەکان بەسادەیی بۆ ڕێی غوربەت خەو دەبینن
دایکیش بەرەو قاپی ئاسمان دەستەو دۆعا ڕاوەستاوە
لە دوورەوە ڕەنگی دیارە لەتیشکی خۆر دابڕاوە

# سیحری بەهار

ئێوارەیە و تارای بەهار نەورۆز هەڵی ئەداتەوە
بۆ پێشوازی ساڵێکی نوێ دڵم ئاگر ئەکاتەوە
دواسەفەری چرپەی بەفرە ئەتوێتەوە بەرەو ڕووبار
ئێوارەی سارد سەری هەڵگرت لەتاو سیحری نیگای بەهار
سلێمانیش مەستی ڕەنگە کوچەو شەقام گشت چراخان
نێرگز بەدەستی گوڵەوە دێت و دەچێ بەرەو جێژوان
خۆ تۆ باخی پڕ ئاوێنەی خۆشەویستی ئەم دنیامی
لە کوێی گوڵم وا شەو داهات هەر تۆ چرای بێ نەوامی
ڕەنگ ئەبارێ بەسەر خاکی شەقامێکی سەر بەرەو ژوور
سیمای عەشق ئەفسانەیە لەڕووی مەستی خۆری پڕ نور
دەریای چاوم لە دووریتا وەکو ئاگر داگیرساوە
واهەستەکەم گڕی نەورۆز بۆ سووتانم داخراوە
ڕێگا وەکو ڕێی میحرابی سەر ئارامگای عەشق وایە
چاوەڕوانم بۆ نەهاتی دەرگای دڵم ئاوەڵایە

# دڵی بەفر

تۆ ڕووباری و منیش باران لەهەر کویٚ بم لیٚت ون نابم
چاوەڕوانی ڕیٚت ئەکیٚشم وەک سیٚبەری بن ساباتم
کاتیٚ لەگوڵ وردئەبمەوە جوانی لەتۆ وەرگرتووە
وەک نیٚرگزی پیٚش بەهاریٚ دڵی بەفری سڕ کردووە
بەر لە چرپە گۆڕینەوە نیگا عەشقی گۆڕییەوە
هەر کە سەیری یەکترمان کرد ناوی خەممان سڕییەوە
ڕەنگە دڵمان دوو کۆتر بن بۆ یەک ئاسمان لەباڵ بدەن
یا لیٚوانی پەپووولە بن کاتیٚ لیٚوی گوڵ ماچ ئەکەن
گەرچی دڵم وەک گژوگیای سەربانی گڵ وشکەڵاتوو
نەک خەم نەما فرمیٚسکیشم بەیەکجاری بەساڵاچوو
ئاویٚنەی ناو ژووورەکەشم ویٚنەی ڕووی تۆم نیشان ئەدا
هەرچی ڕەنگی دنیا هەیە لەڕەنگی تۆ سەردائەخا

# دەروازەی عەشق

کە دەرگاکەت ئەکردەوە، دەروازە بوو بۆ عەشقی من
منیش بەبەر چاوی تۆدا تێئەپەڕیم وەک بای شەرمن
لەجێی نامە گۆڕینەوە ڕازی دڵمان گۆڕییەوە
بەسەرنجی خۆشەویستیت غەریبیمت سڕییەوە
من لە شارێکی غوربەتا بەچاوی تۆ دنیام ئەدی
حەیفە گوڵم ماڵی دڵم ئێوارانێ تۆی تیا نەبێ
گوڵم بۆچی ئەڵێی با کەس پێ نەزانێ بە ئەوینمان
ئەی نازانی گەڵاکانیش بوونە پەرژین لە مابەینمان
شەقامەکان باڵیان ڕاخست تا من و تۆ لێوەی ڕەت بین
تا لەم شارە جوانەی تۆدا تا دوا نەفەس بۆ یەک بژین
بەرگی سادەی نارنجی تۆ مانگەشەوی تەنیایمە
زەردەخەنەی سەر لێوی تۆ دڵنەوایی غەریبیمە

# کەی دێیتەوە

کەی دێیتەوە هەتا خەمی دڵی ماتم هەڵوەرێنم
لەدەروازەی گەڕانەوەت پۆلێ چرا داگیرسێنم
ئێستاش یادی منداڵیمان لەم کۆڵانە چاوەڕوانە
وەک بەلەمی چارۆکەدار ئەستێرەیەک ناونیشانە
لە سەر هەموو شەقامێکا شوێن پێ کانت ئەناسمەوە
لە دەفتەری یادگاریما ئێستاش یادت ئەنوسمەوە
ژوورم وەکو دەشتی سەحرا دەنگی کەسی لێوە نایە
تۆ ڕۆشتیت و من لێرەوە غەریبی وا لە دڵمایە
کەی دێیتەوە تا ئەمجارە وەک دووگەڵای سەرپەل بژین
لە پاییزیش لەگەڵ یەکا بۆ ئەودنیا عەشق بەرین
چاوەڕوانیت بۆتە چرکەی کاتژمێری ترپەی دڵم
هەر بە وەرزی گەڕانەوەت چرۆ ئەکا باخی گوڵم

# سەحرای دڵ

تۆ دیمەنی عەشقێکی نوێت لەسەر خاکی چاوما کێشا
ڕووبارێکی بەختەوەریت بۆ سەحرای دڵم ڕاکێشا
گەرچی منیش وەک درەختی بێسەمەرو بێ چرۆ بووم
لەنێو دەریای نەداریدا شەپۆلی تۆش ئەیدا لە ڕووم
خۆم ئەمزانی وەک فرمێسکم لەناو چاوما ئۆقرە ناگری
کاتێ هەنسک میوانم بێت تۆش ئەڕۆیت و لێم دائەبڕی
کە تۆ ڕۆشتی خواستی دڵت وێنەو سیمای ڕووخسارم بوو
پاییزی من دادت نادا کە بەهارم لەگەڵ تۆ چوو
لەسەر ڕێگەی گەڕانەوەت ڕەنگ و شێوەم بوو بەباران
تۆ بڕوانە لە جێگەی خۆم هەورێ دەستی کردە گریان
ئیتر ڕەنگی خۆشەویستیم لە دیمەنی دڵت دەرکە
گوڵی یادت هەڵوەرێنە چونکە ژێری هەمووی دڕکە

# پەشیمانی

ئەو ڕۆژە دێت، پەشیمانی لەچاوی تۆ ڕەنگباتەوە
گێژەڵووکەی یادەکانم لەسەر ڕێتا هەڵکاتەوە
خۆشەویستی بەفری سپیم ڕێگەی خەمی تۆی داپۆشی
هەر شەماڵی عەشقی من بوو تۆی ئەخستە لەرەی خۆشی
چۆن یادگاریم ئەسریتەوە؟ کە ڕۆژ بەڕۆژ دەنگباتەوە
چۆن لەچاوتا ونم ئەکەیت؟ کەلەناختا ڕەنگباتەوە
با پەنجەرەی ژوورەکەشت خۆرەتاوت بۆ ڕاکێشێ
من دڵنیام شەوانێکی بێ تروسکەت وا لە پێشێ
هەوری ڕێگەی گەڕانەوەت بۆ کوێستانم با ئەیهێنێ
ئەگەر پەڕی گوڵ نەبوایە شەونم لە کوێ خۆی بنوێنێ
ڕۆژێ دادێ لە جێی چرا یادەکانم هەڵکەیتەوە
بەسەر خاکی گەڕانەوەم وەکو باران داکەیتەوە
چۆن دەتوانیت لە بیرم کەیت یاد و شێوەم بسڕیتەوە
وەک خۆرنشین لەدوای کۆچم ڕووی سپێدەم هەڵدێتەوە

# دڵی تار

وەرە جارێ هاوڕێی گیانی ڕێگەی تاری خەماویم بە
تۆ سەرنجی پڕ فرمێسکی دەریای چاوی تەماویم بە
من ئاسمانم بێ ساماڵەو هەوری سەرم بەگریانە
عومرم بەرەو ئاوابوونە لە ئێوارەی ئەم ژیانە
دڵم خامۆش کش و ماتە وەک خامۆشی ژوورێکی تار
لەم هەوارەی کەمن هەمە میوان نابێ وەرزی بەهار
نەگەڵایەک، سێبەرێکی پڕ ئومێدم پێ ئەبەخشێ
نەڕەنگێکی، ئەرخەوانی بەیەکجاری دامئەپۆشێ
ژینم وەکو لێوانێکە بادەی تاڵی ئەخۆمەوە
لەخەمیشا لام شیرینە دووبارە بۆی ئەڕۆمەوە
ئەو بارانەی کە ڕووی کێڵی هەزارانی شۆردۆتەوە
ئێستا منی لە چاوی تۆ بەیەکجاری شاردۆتەوە

# لەهێمنی هێمنتر

ماڵئاوایی چەن ئەستەم بوو لەمابەینی من و تۆدا
کام شەپۆلە دەستی گرتی لەکۆچێکی بەبێهۆدا
لەهێمنی هێمنتر بووی چۆن ڕووبارێک پەی پێ بردی
ڕۆژگارێکی ڕەش و تاریک لەچاوانی منی کردی
وامئەزانی لەپرسەما کۆڕی شیعرم بۆ ساز ئەکەی
بەڵام ئێستا بەکۆچی خۆت پشکۆی دڵم ئاگر ئەدەی
خۆزگە وشەی ماڵئاوایی لە ئەزەلدا هەر نەبوایە
کە دەرگایەک داخرایە سەد دەروازە وازکرایە
چل نشینی ئەم شەوانە تەمەنێکی چلساڵییە
ڕوو ئەکەمە هەرچی شوێنێک بێ تۆ لە چاوما خاڵییە
هەناسەکەم خۆ نەمتوانی هەناسەیەک هەناسەت بم
بۆ حەرفێکی ماڵئاوایی زەردەخەنەی پڕ تاسەت بم

# پرسەی گەڵاکان

پرسە دانێن بۆ گەڵاکان جەستەیان خاک نەیشاردەوە
کزەی پاییز نازی کێشان بەدواهەناسەی ساردەوە
سەفەر بەرەو ئەو گەردوونەی تەنیا گەڵا ئەباتەوە
تا ئاوابوون خەمبارییەک باڵی ڕێگا ئەکاتەوە
سروودی عەشقی گەڵاکان ڕەشەبایەک ئاوازیەتی
تەمتومانی ئەم پاییزە هەڵوەرینێ گوڵنازیەتی
هەر تابوتی گەڵاکانەو لەسەر شانی ڕەشەبایە
دوا چیرۆکی هەڵوەرینیان لەنێو هەگبەی سەفەردایە
لەژێر تریفەی مانگەشەو پۆلێ گەڵا ئێشک ئەگرن
لە پێشوازی مەرگا پشکۆن بەڵام بۆ ژین ساردوسڕن
سەیری بەهار لەوەدایە لەگەڵ خۆیا چرۆ دێنێ
لەجێی گەڵای سەفەر کردوو (با) گەڵای تر ئەشەکێنێ

# ئاوابوونی خەم

تۆ بەتاڤگەی پێکەنینێ نەرمە شەرمێ ئەبارێنی
بەسەرنجی خۆشەویستی ڕۆح و جەستەم ئەبزوێنی
دەسا چیبکەم من باڵبەستی ژیانێکی دیل و کەیلم
هەموو دنیا گوڵباران بێ بەرەو تۆ دێ تاسەی مەیلم
تۆ بڕوانە چۆن مانگەشەو دارو دەوەن ڕەنگین ئەکا
سەرنجی تۆش وەکو هەتاو دنیام پڕ لە ئەوین ئەکا
ئەو شەوانەی کە من هەمن چاوت ڕۆژیان دێنێتەوە
یاسای ژینە کە خۆر هەڵدێ مانگەشەو کاڵ ئەبێتەوە
ئەی خۆرەتاو گەرچی پرشەی نیگای چاوت زۆر بەتینە
تا ئەتوانم بۆت ئەڕوانم ڕووناکی ئەدەی بەم ژینە
دڵم گەڵای درەختێکە شەماڵێک بەو ڕایوەشێنە
وەرە گوڵم لەداری خەم تاسەی کەیلم هەڵوەرێنە

# تریفەی خەیاڵ

وەرە تریفەی خەیاڵی شەوانی بێ ئەستێرەم
من غەریبی لای ئێوارەی شارە جوانەکەی ئێوەم
ڕێگەی عەشقم نیشاندە تا زەردەپەڕ بەدیارە
تەنیا بادەو مەیخانە بۆ ڕۆحم ئینتیزارە
شەکەت بوونی ئەم ڕێبوارە ئاسوودەکە بۆ جارێ
لەم پاییزی غوربەتە بمبەرە نێو بەهارێ
تریفەی چاوی بەنازت ڕۆح لەجەستەم دەردێنێ
گوڵەباخ بەشەرمەوە لە ڕووتا هەرەس دێنێ
تۆی نوری بەر پەنجەرەی نیگای وێڵی شەوانم
لە ڕۆژیشا تەنیا تۆی چرپەو سروەی بەیانم
وەرە ئەمشەو ئاسوودەمکە بێدەنگیم بۆ بشکێنە
ئەستێرەبارانە گوڵم تۆش وەرەو خۆت بنوێنە
لەئامێزی ئەم شەوە چراخانێ بسازێنە
لەم تەمی غوربەتەدا سامالێ وەدی بێنە

# گەڵا

خۆشەویستیت بارانێکە خاکی خەمم ئەشواتەوە
ئاوازێکی پڕ سەفایەو دڵم ڕووناک ئەکاتەوە
سەرنجی تۆ شەپۆلێ بوو خاکی خەمی ڕامالْیوم
ئەو دەمانەی لە تۆ دوورم واهەستەکەم خێر نەدیوم
بەڕووی خۆرت سەرهەڵبێنە بەلام ساتێک مەڕۆرەوە
بەسەر بالای تەنیایما وەکو باران داکەرەوە
تاڤگەی خەیاڵ لەتۆوە دێ دەڕژێتە ناو دڵی مەنگم
هەروەک باخی دەمەو پاییز بێ سروەی تۆ من بێ ڕەنگم
تۆ بەهاری و گیان بەبەری دڵی مردووم ئەکەیتەوە
نازانم چۆن خەیاڵیشم بەرەو لای خۆت ئەبەیتەوە

# گوڵەباخ

خۆشەویستی ئێمە وەکو خۆشەویستی گوڵ وبایە
چیرۆکێکی بێ پایانەو لەدیوانی شیعردایە
عەشقی ئێمە چوار وەرزەیە هەمیشە هەر نەوبەهارە
شەقامێکی باڵاپۆشە لە سێبەری لای ئێوارە
پەنجەرەی ئەم عەشقەی ئێمە بەرامبەر بە خۆرنشینە
وەکو کانی ئەم هەوارە ساف و بێگەرد و شیرینە
گەر نێوانمان بیابانیش بێت لەخەونێکا بەیەک ئەگەین
وەک دوو باڵدار بە ئازادی بۆ لای یەکتر لەباڵ ئەدەین
عەشقی ئێمە هەڵبەستێکە ئاوێنەیە بۆ عاشقان
گوڵەباخی ناو گوڵدانە بۆ دیداری میوانداران
وەکو دڵی منداڵانە پڕ لە یاری و پێکەنینە
بەهیچ زێڕێ پێوەر ناکرێ ئەوەندە قورس و سەنگینە

# چیت لێم ئەوێ

چیت لێم ئەوێ لەمە زیاتر دایمە دڵم وا لە مشتە
چاووم لە ڕێی گەڕانەوەت دەرگایەکی لەسەر پشتە
بڕوابکە دابڕانیش ڕێگەی عەشق لە من ناگرێ
ئەوئەڵقەیەی لەدەستایە هەریەک پەنجەی پێ دیل ئەکرێ
بۆ بێدەنگی کە شیعرێکم هەزار پرسیار لە تۆ ئەکا
بۆ ناپرسی کە هاوارم ڕۆژی سەد جار بانگت ئەکا
خۆزگە ئەخۆم گیان بسپێرم تا ئاسوودە دڵ بسرەوێ
بێگومانبە کە لەو دنیاش بەم عەشقەوە هەرتۆم ئەوێ

## ناونیشان

لەوەرینی هەموو گوڵێک ناونیشانی منی تیایە
چیتر نەرمە شنەی بەهار بەسەر باخی دڵما نایە
ئـاودامانم لە تەنیـایی بەشوێن خۆما پێ هەڵئەگرم
بەفرمێسکی تەڕی چاوم تەمی شوشەی دڵم ئەسڕم
چرای خۆزگەی خامۆشی من بەرامبەر بە ڕەشەبایە
ئاوابوونی دوا سـەرنجـم لە ئـاوێنەی سـروشـتایە
دڵم لە بەر ڕووبـاری خـەم وا بەجـارێ بوو بە دەریـا
کەس وەکو من خەمی نەکرد بە تاقانەو هاوڕێی دنیا
کوچـەی چـۆڵی گەڕانەوەم هەر وەکو خـۆم دڵی تەنگە
چەخماخەی سەر کێڵگەی دڵم دایمە خامۆش و بێدەنگە
بەوەرینی هەموو گوڵێک خەریکە چاوم هەڵوەرێ
کزەی ڕۆحم بۆی ئەسوتێ و بەم ئاهەوە دێتە دەرێ
کەسێک نییە پەنجەرەی سۆز بەڕووی دڵما بکاتەوە
یا بارانێک بە هێمنی گەڵای خەمم بشواتەوە
لەبێدەنگی خۆما غەرقی گومانێکی نادیارم
وەک ڕێبواری بێ سەروشوێن وێرانەیە دوا دیارم

## ناوی نوێ

واتێنەگەی وەکو جاران هەر ناوی تۆم لەسەر لێوە
ئەی نازانی کە گوڵ وەری هەزار خونچە وا بەڕێوە
تۆ هەنگاوێک بەجێم بێڵیت، من سەد هەنگاو لە تۆ هەڵدێم
تۆ کەناوی من بەدناوکەیت من چاوەڕێی ناوێکی نوێم
بڕۆ لەگەڵ ڕووبارێکا گەڕانەوەت لە دوا نەبێ
پەنجەرەی ئەم عەشقە داخەو هەنگاو بەسەر دڵما بنێ
کەی ڕەوایە گوڵی نێرگز لە دوای بەهار سەرباتەوە
یا بارانێک لەهاوینا باڵای دارێک بشواتەوە
وانەزانی ئێستا دڵم وەکو چرای خامۆش وایە
تازە تیشکی هەتاویش بیت ئیتر چاوم پێت هەڵنایە
بڕۆ لە ژێر هەوری ڕەشی پەشیمانی خۆت دانیشە
چوون ڕابردووی تۆ ئێستاکە لای کەسێکی تر بە ئێشە

# دەست بە نێرگز

ئەی ڕووباری سەرهەڵگرتوو لەگەڵ خۆتا بۆکوێم ئەبەی
منی گەڵای وەریوی خەم بەشەپۆلێک نوقمم نەکەی
بمبەرەوە لەگەڵ هەورێ بمبارێنە سەر وڵاتم
وا لە تۆفی غەریبیدا دڵم تەزی و ڕەق هەڵاتم
دەستم بگرە وەکو بایەک کە چۆن پەلی چڵێک ئەگرێ
یا وەک شنەی زەردەخەنە کە فرمێسکی چاوم ئەسڕێ
هانێ دەستم ،ها تەماشام ، بمبەرەوە بۆ نسارێ
دەی ببارێ وەکو ئەشکم بەسەر خاکا وەرە خوارێ
وەکو بۆنی چەپکێ نێرگز لە دەستێکا هەڵمڕێژە
لە دەروازەی شارا دامنێ و لەوێ خەمم پێ بنێژە
ئەوسا لگەڵ ئێوارەیا دێم لە قاپی دڵت ئەدەم
چاوی خۆزگەم لە خەرمانی چاوەڕوانی تۆ شەن ئەکەم

# نەزری خەندە

من بینایم هەوری لێڵەو غەریبی وا لەچاومایە
پێکی مەینەت ئەخۆمەوە خەم لە دڵی گریاومایە
بەڕوومەوە پێمەکەنە خونچەی لێوت هەڵئەوەرێ
نەبا سیمای دڵی تەنگم زەردەخەنەت لەیاد بەرێ
گوڵ نیم هەتا منیش وەک تۆ پێکەنینم ئاودامان بێ
لەسەر لێوی وشکەڵاتوم نەزری خەندەی پڕ باران بێ
ئیتر تۆ چۆن تەرزەی نیگات ئەبارێنی بەسەر منا
کە ئەزانی من باخیش بم وام لە وەرزی گەڵا ڕنا
دڵم گوڵی سەر فەرشێکە چەن بێگەرد بێ پێی لێ ئەنێن
لـە گـوڵدانی دڵی منـا زەردەخـەنەی تیا دامەنێن
با لێوی تۆ وەنەوشە بێ و لێوی منیش خاکی بیابان
زەردەخەنە لەخۆت جوانەو منیش هەوری چاو بەگریان

# نامەی باڵدار

شەوانێکە بەفری چاوم لە دوریتا ئەتوێتەوە
دەنگی دڵم وەک لای تۆ بێ بەمن ئەڵێ هەر دێتەوە
دڵی تەنگم ئەڵێی هەوری پەشۆکاوی بێ بارانە
دەوەرەوە لە دووریتا وا باڵئەگرن ئەم نامانە
ئەم ڕۆژانەی لە تۆ دوورم گیانکێشانم لا ئەنوێنن
ئای چەن سەختە ڕۆحی شیرین لەجەستەما دەرئەهێنن
کە تۆ ڕۆح و هەناسەم بی چۆن بتوانم بێ تۆ هەڵکەم
گوڵ گوڵ وەرە، نمنم وەرە ، با بەبۆنی تۆ خەم دەرکەم
هەموو ساتێک وەک غەریبێک تەنیاو تەنیام ئا لەم شارە
کەی دێیتەوە گوڵی خۆزگەم خۆ پاییز ڕۆی وا بەهارە
کەدوو چاوی خۆشەویستیت خۆری دنیای ڕووانینم بێ
چۆن ئەتوانی بێ من بژی کە گوێت لە ناڵەو شینم بێ

دیوانی

# زریان

نیوەشەوە ئەستێرەیەک هەر وەکو من گۆشەگیرە
ئاخۆ ئەویش بۆکێ وەک من نوقمی دەریای هەست و بیرە
ئەڵێی گەڵای پاییزێکم کە بێئاگام لەوەرینم
بەڵەمێکم لەم زریانە هەر شەپۆلی خەم ئەبینم
وەک چۆن هەوری ڕەشپۆش ئەگری بەسەرچەتری ڕێبوارێکا
منیش چاوی تێڕوانینم والەڕێژنەی بەهارێکا
وەکو گوڵی دوور لەباران پاییز دەستم دەگرێ و دەمبا
غەریبییەک لەدڵمایە شوێن پێی ڕێگەم نیشان ئەدا
بای هەناسەم بۆ سوتانم پشکۆی دڵم ئەگەشێنێ
چراکەشم بۆ خەمی خۆی دڵی تەنیای ئەسوتێنێ
لەگەڵ سایەی تەنیایما دوو دیمەنین لە تەنیایی
لەڕەهێڵەی سەختی خەما بۆ یەک ئەژین بە جودایی

# بیابانی خۆزگە

خۆشم ویستی وەکو نامەی غەریبێکی دوورە وڵات
بەڵام هەموو حەرفەکانم هەڵوەرین و کەوتنە بەر پات
وامـدەزانی وەک نەوبەهار پـڕ لـە بـۆنی هـەڵاڵانی
کەچی درکی بیابانێک بووی ڕەنگی گوڵت هەر نەزانی
خۆ تۆ چرا نەبووی بۆ خۆت، ئێستا بۆ کێ داگیرساوی
وەک فرمێسکی پاش گریانێک لەهەنسکیش بەجێماوی
درەختێکی بێ سێبەر بووی بۆ ڕووباری دڵی پاکم
نەمدەزانی گەڵای مەستیت دەبارێنی بەسەر خاکم
مناڵانە بەشوێن پێتا بەسەر شێتی هەنگاوم نا
بۆیە لـەنـاو دڵی خـۆمـا شـکـاوانـە دڵم دانـا
هاتی وەکو ڕەشەبایەک بێوەفایت پێ ناساندم
مەلی خەندەو پێکەنینت لەناو باخی دڵ تەراندم

# نەوای عەشق

ئەم نەوایە عەشقی تۆیە وا لەڕۆحما ئەتوێتەوە
لەگەڵ هەموو نیگایەکتا بەفری خەمم ئەچێتەوە
بەسەر چیای بالآی تۆدا تەرزەی عەشقم داباریوە
هێندە بەرزی لەبەرزیتا کەسێکی وەک تۆم نەدیوە
ئەڵێی لوتکەی کوێستانێکی کە خۆر لەسەر سەری نایە
یا وەک خونچەی دڵئارامێ لە چاوەڕێی شەماڵدایە
کام پەنجەرەی خۆشەویستی بەڕووی تۆدا ئاوالآ کەم
کام فرمێسکی پڕ شەونمم بەسەر شانی گەڵا داکەم
ئەو نیگایەی کەتێم ئەگری چەخماخەیە بۆ ناوهەستم
چی بنوسم کە پێنوسم شەرمەزارە لەبەر دەستم
کەنەتوانم پێناسەیەک بۆ جوانی تۆ بدرکێنم
مەگەر لەناو تەماشاما نمەی خۆزگەم ببارێنم

# فرمێسکی هەناری

هەنارییە دوا فرمێسکم دەنکە دەنکە دێنە خوارێ
هەموو دنیا خەندە بگرێ لای من تەنیا خەم دەبارێ
نەبزەیەک نەسیمایەک زەنگ لە دەرگای دڵم نادا
نەهاوارێک نەئاوازێک بۆ خۆشبەختی بانگم ناکا
بێگومانم کە تەنیایی هەر ڕۆژێ بێ دڵم ئەخوا
بەڵام بێجگە لە فرمێسکم کێیە خەمی دڵم ئەشوا
پەنجەرەی چاو لەسەر پشتەو دەرگای دڵم ئاوەڵایە
چاوەڕوانی شەماڵێکم بەڵام چبکەم هەر سەر نایە
دڵی ماندووم بە بێدەنگی وەک شەقامێک ڕاکشاوە
ئەڵێی ئەشکم ڕووبارێکەو لە چاومەوە ڕاکێشراوە
لەگەڵ خەما وا ڕاهاتووم پێکەنینم بیرچۆتەوە
تەنیا خەمە جێی غەریبی لەناو دڵما کردۆتەوە

# دەریای ئەشک

ژیانی من چیرۆکێکە بۆ دەپرسی کەدەزانی
لە وێرانەی خەمباریما وچان ناگری بەئاسانی
لەئاسمانی من مەڕوانە قەت ئەستێرەی تیا هەڵنایە
ئەو سێبەرەی کەمن هەمە درەختێکی بێ گەڵایە
پەنجەرەکەم هەروەکو خۆم لەناو تەما داخراوە
لە جێی چرا ئەشکی چاوم بۆ تەنیایم هەڵکراوە
گێژەڵووکەی ئاوێنەکەم وردە وردە ئەمشێوێنێ
بەفرم عومری ژیانیشم وەکو سەرم هەرەس دێنێ
شەپۆلی خەم لەناو دڵما وەک تەوژمی دەریا وایە
دواهەناسەی پڕ هەنسکم ڕەهێڵەیەو گڤەی بایە
ئیتر بۆچی لێم دەپرسی خۆری نیگات بۆ هەڵنایە
کە ئەزانی دەریای ئەشکێ لە سنوری چاوانمایە

# خەوو خەیاڵ

چەن خۆشە ئەو خەیاڵانەی شەوان دەستم دەگرێو دەمبا
وەک بەلەمێ لەدەریادا بەسەوڵی خۆم ڕێگا دەکا
بزەی مەیلم گەر خەمبار بێ بەخەمباری پەلم دەگرێ
بەڵام دڵم وەک باڵدارێ بۆ ئاسمانی خەیاڵ دەفڕێ
کە بێزاری بەرەو ڕووم دێ دەچمە وەرزی خەوو خەیاڵ
چی لە ڕاستی ژیانم کەم کە جێماوم لە چەندین ساڵ
دەڕۆم وەکو پەپوولەیەک باڵی ڕێگەم بێ سنووره
وەکو بایەک دێم و دەچم ڕۆح لەجەستەم هێجگار دووره
چەن خۆشە ئەو خەیاڵانەی وەک نەورەسێ لەباڵ ئەدەی
وەکو هەورێ کوێت پێ خۆش بێ بەڕێژنەوە لێی دائەکەی
بەڵام حەیفێ خەیاڵی شەو وەکو بەفر دەتوێتەوە
لەسەر لوتکەی ئەستێرەش بی لە جێی خۆتا ئەتلێیتەوە

# بەفری دەریا

هەتاکو کەی چاوەڕوان بم وەکو گوڵێک لە ڕێی شەماڵ
ئەی نازانی کە تۆ نەبیت بێ بەهارە چوار وەرزی ساڵ
وەکو شاخە بەفری دەریا لەناو ئەشکما توامەوە
لەناو باخی خۆشەویستیت وەک نەمامێک ڕووامەوە
دەوەرەوە وا پەنجەرەی ژوورەکەشم چاوەڕوانە
وەک هەتاوێ وەرە ژوورێ با تێپەڕێ ئەم شەوانە
کێ گوێ لە دەنگی من ئەگرێ کێ خەمی من ئەخواتەوە
کێ وەکو تۆ لەناو دڵما گڕی عەشق ئەخاتەوە
بۆچی نایەی وەک شەپۆلێک دەستم بگری بەرەو کەنار
هەتا عەشقم وەکو مەلێک لەباڵ بدا بۆ دوا هەوار
دوا هەواری عەشقی ئێمە وەک سێبەری دار چنارە
لە ژێر چڵێک وەک دوو باڵدار ئەڕوانینە ئەو بنارە

# کاڵبوونەوە

لەبیرت دێ هەموو ڕۆژێ ڕووناکی بووی بۆ چاوانم
کەچی ئێستا لە ناسینی یەکەم ڕۆژت پەشیمانم
یەکەم گوڵی کە بۆت ناردم ئێستا هەر خۆم ئەیوەرێنم
گەر بۆم بکرێ ئەو ڕۆژانەش لەتەمەنما دەرئەهێنم
ئیتر ئەشک لە چاوانما بوو بە وەرزی باران بڕان
بێزار ئەبم لەو شەقامەی کە بۆ ساتێک ئەبووە جێژوان
دوا هەتاوی خۆشەویستیم لەچاوی تۆ ئاوا ئەبێ
ئیتر شنەی دوا سەرنجم بەشوێن پێتا هەنگاو نانێ
نەمدەزانی لەگەڵ تۆدا دواین ڕۆژم شەوی تارە
نەک هەر چاوت بگرە چرای ژوورەکەشت بێ بڕیارە
با هەمیشە لەشەودا بم هەتاوێکم ناوێ لێڵ بێ
چی لە عەشقی سەرەڕۆکەم وەکو کەشتی دەریا وێڵ بێ

## لاپەڕەیەکی نوێ

بەیەکجاری لەبیرمکە ڕەنگ و دەنگم بسڕەرەوە
لاپەڕەی نوێ و سپی و ڕوونتر لە ژیانتا هەڵدەرەوە
چاوەڕوانی ڕێگەم مەبە لەگەڵ بایا ڕێم پێ نابڕێ
شەرمەندەم کە فرمێسکێکم لە چاوانی تۆ پێ ناسڕێ
کە نەتوانم مۆمی دڵم لە سەر ڕێتا داگیرسێنم
ئیتر بۆچی لە ئاوێنەی هیوای تۆدا خۆم بنوێنم
ئەی فریشتەی دوا مەبەستم دووربە لەمن تا ئەتوانی
نەک ژیلەمۆی خەمەکانم بتسوتێنێ و پێ نەزانی
برۆ بەشوێن ئەو دڵەدا کە خەم بەلای دڵیا نایە
پەنجەرەکەی لەسەر پشتەو دایمە بەرامبەر بە بایە
من کە دەستم بێ سامانەو ژوورەکەشم بێ چرایە
بێگومانبە زەردەخەنە قەت لە دەرگای لێوم نایە

# سلێمانی

له جوانیدا ئەڵێی بووکی چوار وەرزەیە سلێمانی
بەمۆسیقای ڕەشەباکەی سەما ئەکا دارەکانی
پڕ لەنازە خۆشەویستی تاڤگەو ئاوی سەرچناری
له دوورەوە بانگت ئەکا بۆ سەرمەستی نەوبەهاری
دەمەو زستان بەبێگەردی ڕەنگی بەفر دەکاتە بەر
گۆیژە سەری سپی دەبێ و تاجی سەرما دەکاتە سەر
له پاییزا گەڵاکانی فەرشی تەلای سەرە ڕێیە
لەناو دەریای ئاسمانیدا باڵندەکان نازیان پێیە
ئەڵێی سیمای ئەفسانەیە لوتکەو گرد و لەپی دەشتی
نیگای پڕی گەلاوێژی ئەڕوانێتە باخی گشتی
ئێوارانێ خونچەو گوڵی دەرکی سەرا ئەشنێنەوە
تەنیا جارێک لەم شارەدا خەم له دڵتا ناهێڵنەوە

# شەوی بێدەنگ

ئەمشەو دڵم بیابانێکە باڵدارێکی لێوە نایە
بەتەنیایی ئەڵێی کەشتی بێ چارۆکەی ناو دەریایە
شەوی تارە ئەم سروشتە وا ڕەشپۆشە ئەم دنیایە
چراکەشم هەروەکو خۆم چاوی ڕوونی بۆ هەڵنایە
ئەڵێی پرسەی مەرگی خۆمە وا بێدەنگی ڕاوەستاوم
ئەبێ چی بێ وا بۆ ئەمشەو گیان ئەسپێرێ هەردوو چاوم
درەختەکان ئەڵێی چەترن ڕەنگی شەویان لێ باریوە
شەقامەکان ڕەشتر لە شەو هاتوچۆیان لێ تەریوە
ئاسمانی شین ئاودامانی چارشێوێکی تارو لێڵە
تەنیا منم لەم شەوەدا وەکو مەڵێک جەستەم وێڵە
شار بێدەنگ و کپ و خامۆش دەنگم بەهیچ کەسێ ناگا
هاوارێکی دەم بەخەندە بۆ خۆشبەختی بانگم ناکا

# وێرانە

لە ڕوخساری من مەڕوانە خۆر لە چاوما قەت هەڵنایە
کە بەخەندە بۆ تۆ ئەدوێم قوڵپی گریان لە ناخمایە
نەگریانم خەندە ئەگرێ و نەفرمێسکم گوڵ دەرئەکا
زەردەخەنەش بێتە لێوم دیارە دڵم فریو ئەدا
ئاسمانێکم بێ ئەستێرە و دەریایەکم بە بێ شەپۆل
وەک پەیکەری بێ ناونیشان لە وێرانەی شارێکی چۆڵ
کانی چاوم وشک بووە دڵ و هەستم وەک بیابانە
وەکو مردوو خۆم ئەبینم کە بێ خەم بم لەم ژیانە
ئەوەی کەهەست بەژان نەکا دیارە کەخەم نایدوێنێ
خەمە هەوری گریان دێنێ و لە چاوانما دەیبارێنێ
دەستم دەگرێ بۆ گریانی بێ سەبوری و ناهەمواری
کەخەم دوور بێ واهەستەکەم هۆشم نییە بەبێداری

## ئێوارەیەک

ئێوارەیەک بەیادی تۆ چوومە دێنی کۆنە جێژوان
وامدەزانی تۆ هەر لەوێی چاوەڕوانی وەکو جاران
ئاسوودە بووم بەو خەیاڵەی وەکو باران بۆنی دەهات
کە چاوی تۆ تیشکی نەما ئیتر شەوم بەسەردا هات
ئێستاش لەناو دەریای چاوما نەورەسێکی بێ کەناری
تازە خونچەی ڕێواسێکی تۆ هەوێنی نەوبەهاری
خەیاڵیش بێ سەرمەستم پێی کەچاوی تۆ لە چاومایە
گەر یادی تۆ نەبێ چاوم قەد ڕووناکی تیا هەڵنایە
چەن شیرین بوو ئەو ڕۆژانەی دووبەهار بووین لەیەک وەرزا
سێبەرێکی دووباڵدار بووین بێجەستە بووین لەسەر ئەرزا
دوو پەنجەرەی کراوە بووین بۆ با دەستمان ئەکردەوە
تیشکی خۆرمان بۆ ئاوێنەی ژووری تارمان ئەبردەوە

# بگەڕێوە

بگەڕێوە هێشتا گوڵم لە ڕێی تۆدا ئەشنێتەوە
تەمەن بەشی غوربەت ناکا ڕێژنەیەکەو ئەبڕێتەوە
بۆ کوێ ئەڕۆی کەتۆ دڵت هێشتا لێرە بەجێماوە
لەبەر قاپی ژوورەکەی خۆت وەکو چرا داگیرساوە
بگەڕێوە شوێن پێی جاران وا خەریکە کاڵ بێتەوە
نەک بەجارێ لەغەریبی پێکەنینت بیرچێتەوە
نەبا ئەشک دواین دێڕی نامەکانت بشواتەوە
ئەویش وەک خۆت بەبێدەنگی لەگەڵ بەفرا سەرباتەوە
درەنگە بۆ گەڕانەوە ئەی فرمێسکی هەڵنەوەریو
دەوەرەوە ئەی ئاوێنەی تەم لێنیشتووی هەتاونەدیو

## قەدەری ئاوابوون

فرمێسکێکم بۆ داباریین گەڵایەکم بۆ هەڵوەرین
دڵم بۆتە پرسەخانە بۆ پێشوازی لەخەم و شین
گڕی ساردی داری تەڕم بەهیچ کەسێک ناکرێمەوە
پیرەداری هەڵکەنراوم جارێکی تر ناڕوێمەوە
لەرەی دەستی هێزی ماندووی بەساڵاچووی بێ گۆچانم
هەست و هۆشی بێ ئەندازەی سەرشێتێکی نەوجەوانم
وەکو داری وشکەڵاتوو شەو ڕوون ئەبێ بەسووتانم
تاپەنجەرەی قەفەسێکە دوا سنوری لەباڵدانم
بەلەمێکی بێ کەنارم بێ ئەستێرەی ڕێنیشاندەر
ڕێبوارێکی نەناسراوم کەوتومەتە دەستی قەدەر
ئیتر تۆ چۆن هانا دێنی بۆ دوو دەستی بێ سامانم
کە تەنیایی بۆتە چەتری بەسەر هات و ناونیشانم

# پێوانەی تەمەن

تەمەن بۆچی وا بێوەفای ساتێک لەڕێی من ناوەستی
دەستم دەگری بەرەو پیری و دەرگای خۆزگەم لێ دەبەستی
من ڕۆژ بە ڕۆژ تۆ دەژمێرم تۆش بالای من دەڕوخێنی
تۆ چڵێکی منیش گەڵا هەر ڕۆژێ بێ ئەمەوەرێنی
هەموو ڕۆژێ وەکو بایەک گەڵای عومرم ڕائەماڵی
نازانم بۆ بەشێوانی ڕوخساری من وا عەودالی
لەگێژاوی خەمباریما دڵم نایە دەستت بەردەم
پێم بڵێ بۆ لە دوا ڕۆژم دنیام ئەکەی بەهەورو تەم
سەیرە بۆچی تۆم خۆش ئەوێ کەئەزانم بەجێم دێڵی
هەرچی خاکی ڕێگەم هەیە سەرشێتانە پێم ئەکێڵی
خۆزگە یەکەم ڕۆژی بوونم سیمای تۆم هەر نەناسیایە
بەبێ مەبەست ڕێگەی ژینم بەهەنگاوم نەپێوایە

# ئاوێنەی شکاو

ئەگەر دەستم وەکو گوڵێک لە ناو لەپی دەستا وەری
چۆن ئەتوانی وەک پەپوولە بڕوانیتە گوڵێکی دی
یادگارێکی بێ سنوورم لەتەمەنتا جێهێشتووە
هەتا هەوریش بەقەد چاوم فرمێسکی بۆت نەڕشتووە
کە تۆ وەکو بەفر هاتی سپی و بێگەرد ئەچوویتەوە
بەڵام وەکو پەڕەی شیعرێ بەڕشپۆشی نوسرایتەوە
لەگەڵ ئەشکم کە هەڵوەریت ناچیتەوە ناو چاوانم
ئەگەر ڕێشمان بەیەک بگا نابێتەوە بە جێژوانم
کە ئاوێنەی دڵم شکا بەدەستی تۆ کەوتە خوارێ
وەکو گەڵا کە چۆن بارەش ئەیوەرێنێ لە بن دارێ
شەپۆلانی تاڤگەی یادم چۆن لە دڵتا خامۆش ئەکەی
لەناو دەریای یادەکانما بۆ کەنارێک شەپۆل ئەدەی

# پەنجەرە

هەموو ڕۆژێ پەنجەرەکەم چاو ئەبڕێتە دەرگای کۆڵان
هەرچەن خومار داپۆشیوە چاوەڕوانن دڵ و چاومان
زۆر دەترسم ڕەشەبایەک دەرگای خۆزگەم لەسەر داخا
ئیتر دەنگم بەکەس نەگا لەناو بیری ئاخ و داخا
هەموو عومرم کە دەژمێرم تەنیا هەر یەک هەناسەیە
وەکو خوانی نەدارانێ هەمیشە هەر بێ کاسەیە
چەن شیرینە ئەو شەماڵەی پەنجەرەکەم ئەکاتەوە
هەر هەتاوە بەڕووناکی دڵنەوایم ئەداتەوە
لەناو ژووری تەنیایدا تاکە هاوڕێم کزەی خەمە
دەسا چیبکەم لەم وێرانە کە میوانم هێجگار کەمە

دیوانی

# غەریبی

وەرە هاوڕێ تەمەن لەسەر غەریبیمان ڕاناوەستێ
گەرچی دڵمان لای یەکترە غوربەت چاومان پێ دەبەستێ
گەڕانەوە بۆ منداڵی بۆ گەڕەکی یادەکانم
غەریبی وا وشکی کردووم ئەڵێی خاکی بێ بارانم
ئەو نامانەی دێنە دەستم وەکو ڕێمان داخراوە
چی لەگڕی غەریبی کەم بۆ تەنیایم هەڵکراوە
بێدەنگی من دواهەنسکی پشکۆی دڵی ئازیزانە
هەرچەن عومرم بەجێم دێڵێ بەڵام چاوم چاوەڕوانە
بڕۆمەوە بۆ ژێر سایەی ئەو شاتووەی کە دەموەران
تا وەرینی ئەشکی سوورم لێ نەبێتە داری گریان
چی لە باخی هەڵوەریوکەم گوڵی خۆزگەم لێ نەچنیوە
لەو ڕۆژەوەی لە خۆر دوورم سایەی باڵای خۆم نەدیوە

# پەرەستەمەن

بریا عومرم بەقەد عومری گەڵای داری هەرمێ بوایە
دواسەرنجم وەک تەماشای ساباتێکی لارێ بوایە
ڕۆژێ چاوی سیحری ژیان بەنازەوە بۆم دەڕوانێ
جاری وایە من بە ژووری پرسەخانەی خەم دەزانێ
چەن شیرین بێ ئەم ژیانە دواین قومی ژەهری مارە
ئەگەر خەندەش ئاوێنەم بێ لەسەر گۆڕم لێو بەبارە
تەمەن وەکو مۆمێک وایە بێگومانم دەتوێتەوە
گەرچی ڕۆحم ئاوا ئەبێ بۆ مەینەتی هەڵدێتەوە
سەیرە خونچەی بەهارانیش بیر لە وەرین ناکەنەوە
نازانن هەر ڕۆژێ دادێ دەستیان لە چڵ ئەکەنەوە
بێ سەمەرە خۆشەویستی لە گەڵ ژینا کە بیبەستی
ڕۆژێ دادێ گوڵی عومرت پەرە پەرە بەیتە دەستی

## تاجی گوڵ

هێندە بەرگی ئاڵ مەپۆشە نەک لە چاوما بتوێیتەوە
ئەڵێی گوڵی نەبەهاری کە بۆ شەماڵ ئەشنێیتەوە
لە دوورەوە کە ئەتبینم تەزووی ئارام بە دڵما دێ
خۆشەویستیت هەتاوێکە لە ئاوابوون جوانتر ئەبێ
کە ڕەنگاڵەی هەمووسروشت لەڕوخساری تۆیا دیار بێ
بڕوامەکە زەردەخەنە لە ناو دڵما بێ دیار بێ
زوڵفت بە با شەپۆل ئەدات وەکو دەریای بێ بەندەرە
تاجی جوانی هەموو گوڵێک شێوەی نازی تۆی لەسەرە

## کراسێك لەبەفر و جەستەیەك لە ئاگر

×××× ××× ×××

شەپۆلەکان بەقسەی دەریا هەستانە سەرپێ ..
نەیانزانی کەنار کوشتە ئەبن
دەمەو ئێوارەش هەتاوی سەرلێشێواو
لەسەر سنگی نەرمی دەریاوە
تەماشای نەورەسە تەریوەکانی ئەکرد
ئیدی وازبێنە لە دەریا
هەمووی چەم و ڕووبارە سەرەڕۆکانی خۆمانن
لەوێ ئاڵاونەتە یەکتر و ئاوێتەن بەعەشقی یەک
لێرەش .. ئاە لێرە .ئەو دەمەی وەک درەختێکی دەمەو پاییز
..ڕووت و قوت کرامەوە
بەفر کراسێکی پێ بەخشیم، بەڵام تاسەی ئاگرێ
لەبەرما دایدڕی .. بێ کراسخۆم لەم داستانی پڕ گومانەدا
ئای بەفر چەن بەرگێکی سادە بووی
تۆشم پێ ڕەوا نەبوویت.
تازە من بەشێکم لە خۆڵەمێش

بۆیە ئەم هەموو دوعاو شەونوێژانەی
دایکیشم هیچ بڕیان نەکرد
وەرە با دەستی با بگرین ، ئیتر ئێمە کوڕی باین
خەتای خۆمان و نەفرەت لە شیر مەکە
بڕوانە چۆن ڕەشبەڵەکی پەڵەهەورەکانە و
هەورەگرەمەش دەهۆڵیان بۆ ئەکوێ
گوێ بگرە دەنگی دەهۆڵ لە ئاسمان خۆشە
وەرە تا ڕووبارەکان شاخەکانیان ڕانەماڵیوە
با لە سێبەری گەڵا زەیتونێ .. کەشتییەک دروست بکەین
بەڵام ئەمجارە بێ ناخودا ئەڕۆین
بەتەمای ئەو پیرە مێردانە مەبە کە لە کۆڵانی حەقیقەت
دانیشتون، تا لە زمانی ئاو بگەن
هەناسەیەک قامچییان دایە دەست قەڵەم پێیان نوسی سێدارەو
شەللاق .. هەناسەکەم مەحاڵە بەرگەی هەناسەیەکی تر بگرین
.. مەینەتی وەک دارگوێزێک چارشێوی سێبەری ، بەسەر من و
تۆدا کێشاوەو شەکەتی کردوین بۆ هەستانەوەمان، سەیرە چۆن
گەڵای ڕۆح بەرگەی ئەم هەموو تەرزەی ژانە ئەگرێ؟ ئەو
دەمەی شینی خۆرشتەکەیان گێڕا
من و تۆ چەترمان بۆ تەرزی بەر تەرزە هەڵدابوو

بۆیە وا ئەمشەو بێ نان ماینەوە
ئەترسم ئەم جادووە چوار لۆیە بکرێتەوە
ئایەتەکانی ناو دڵیشمان لە بیر چێتەوە
دانیشە، دانیشە و لەبەر ئاوێنەی عەدەم قژت دامەهێنە
ئەو شانانەش بکێشێنە کەلە با بۆیان دروست کردوین
ڕێگامان ڕێگەیەکی ئەفسوناوی بوو
من و تۆش بەشێک بووین لەبێ قاچەکان
بۆیە زوو هەستمان بە ئازاری
قاچی ئەو منداڵە پێ پەتییانە کرد
کە ژێر پێیان دەرزی ئاژنی زیخەکان بوو
لەلایەکی تریشەوە زیخ ژێر کەوشی ئاغاکانی ماچ ئەکرد
ناهەقی دایکتان ناگرم
کە لەبەر دەرگا دائەنیشت
زەمی کوڕەکانی ئەکرد بۆ گالیسکەو دەستفرۆشەکان
ئەو بەرماڵەکەی بەرامبەر پەنجەرەکە ڕاخست
کەچی ئێوە سەرتان لێشێوان و پێتان وت
بۆ قیبلەی ئەم ماڵە
ئەبێ پشت کەیتە پەنجەرە
ئێمە چاومان نەبەخشی بەئاو

وێنەیەکی هەتاومان لە چاومانا بۆ نەکێشرا
بۆیە نەمانتوانی لە هەتاو ورد بینەوە
ئەمە خورافاتی تێڕوانینە ئەزیزم تازە بەپەنجەی سارد و سوتام
هەنارێکم لە داری ئومێد بۆ ناپچڕێ
بە دوا هەنگاوی سەرنجم ئەم ڕێگا تەماویەم بۆ نابڕڕێ
مەگەر ئیتر گوێ لە باڕەشی حیکایەتخوان بگرین
هەتا بەدەم مەرگی گەڵاکانەوە ئەگەینە دۆزەخی هەڵکراوی
خۆمان .. تۆ دەستت دایە بینەقاقای بلوری چراکە بۆ یە ڕووناکی
خنکا ..ئەی ئاسمان بۆ دەرفەتت نەدا بە جریوەی ئەستێرەکان
دوو حەرفم لە گوڵ فێرکەن
شەو کەوتە هەناسە بڕکێ و لە ترسی کازیوە
ئاوڕی ئەدایەوە منیش هەر بەدیار تەرمی زەردەخەنە
کوژراوەکانەوە بووم .. لێم گەڕێ تۆ لە من ناگەی
من کیشوەرێکم لە بێدەنگی و
شارێکم لە شەونمی بەر مانگەشەو
تەماشاکە ڕووەو ئێوارەیەکی بەسالاچووین
لەسەرابی ناخمانەوە دواهەناسەی سوتاو
بەئاهێکی ساردەوە دێتە دەرێ

بەفر ئاسا کەوتینە سەر خاک
ئێستاش لە پرسەی بێگەردیمان ئەتوێینەوە
چی لەبەهارکەم کەنێرگز سەرچۆپی نەگرێ و
هەڵاڵە باوەش بۆ با نەکاتەوە
کزەی سەرشێتی ئەم پاییزەش
بووە بەئاگردانێکی بێ شوعلە گوڵ و گەڵا ئەسوتێنێ
شەوان بەدیار چاوی گوڵاڵە سوورەوە
ئەستێرە کوێر ئەکەن
لە ماڵێکی ساردو سڕا خوانی نان نەدیوم پێ ڕادەخەن
پەپوولە باڵ سووتاوەکانم لێ ئەکەن بە گوناهباری دۆزەخ
لە ئاوێنەی باخێکەوە سەرابێکم نیشان ئەدەن
لێم گەڕێ هەناسەکەم ..تازە دڵم بۆ میقات ناکرێتەوە
ئاوێنە شکاوەکانی سەرنجم نیشان مەدە
ئێمە لەژێر چەخماخەدا چاومان هەڵهێنا
ڕەشەبا فێری هەنگاونانی کردین
لە بێشکەی قەدەرا گەورە بووین
تازە من بە تولە ڕێی منالیما
هەموو ڕێگاکان ئەناسمەوە.

چێژ لە مناڵی وەرئەگرم بەشەقامێکی مەنفا
کۆڵانە ئاوڕشێنکراوەکانی ڕابردووشم لێ زەوت مەکە
چی لەتەمەنی ڕابردوو کەمکە پەیوستی تۆ بوو گوڵەخان
لە پاش فرمێسکە باران ئەتەوێ بە پەیژەی هەورا سەرمخەی، یا
بەئاوازی باران بمخەوێنی
من لە دەنگی ئەو کەنارییانە سۆز وەرئەگرم کە قەفەز لە
سروودیان هەڵئەلەرزێ لەپەنجەرەیەکی کورتەوە ئەڕوانمە ئەو
سنەوبەرە قەیرانەی کە ڕووبارە سەرەڕۆکان
پێیان ئەڵێن دانیشن بەخێر.
کەسێک نەما سەبوری خۆی بزر نەکا شاتووە شێتەکەی
حەوشەی گەورەش بەدەم باوە سەر با ئەدات
ترسی منالان لە خوێن بینین ئەشکێنێ
هێشتا ڕۆژ بەدەر نەبوو بەشوێن ئەستێرەی ڕێنیشاندەرا ئەگەڕان
تۆش وەکو ڕێبوارێکی بێ ناونیشان
بەتەماشایەکی دوورەوە لاکەرەوەو هاوار مەکە
چونکە لەگەڵ هەموو هاوارێکتا دەنگانەوەی دەنگی خۆتە
لەقاپی ئاسمان مەدە نەبا ئەستێرەیەک لێمان زیز بێ و

مانگەشەویش دەرگامان لێ نەکاتەوە
نازانم لەکوێوە بەڕێ کەوم
لە کۆڵانە بنبەستەکانەوە یا لە شەقامە سەرەڕۆکانەوە
کێ بوو بەختی گوڵەکانی بەست
کێ سەری لەهەور شێوان تا لەچاومانەوە داباریێ؟
زەماوەن قوفڵی لێدراو دەرگای شەڕ کرایەوە
ڕامان و هاوار و بێدەنگییە
بەلاتەوە سەیرە کە جارێکی تر نێرگز تارای بەهار هەڵباتەوە
سالانێکە چاومان بەفرمێسک ئەشۆین
کەچی ئەم ڕێگایەمان هەر بۆ ڕوون نەبۆوە
عەشقیش وەک گوڵی سەر فەرشەکان چڵکی لێ نیشت
ناچاری سێبەری بالابەرزەکانی
هەرزان فرۆش کرد بە زەوی ..
ماڵەکە بووە بە پرسەخانەو
دەرسی لاوانەوەی تیا ئەڵێنەوە
باخەوانەکانیش کەوتونەتە باڵبرینی چڵە گەنجەکان
دەستی ئەو چڵانە ئەبڕن کە ئالاونەتە یەکتر
ئاوێزانی لاولاوو سێو بەحەرام ئەزانن
خۆت پیرکە ئەی کەپری سەرم

## ئەمە وەرزی ئەوین نییە

نازانم ئەم ڕۆحە بێ پەروایە بۆ هێندە ئاشنای عەزابە
ئەم باخی دڵە بۆ ڕەنگی ئێوارەو بۆنی شکۆفەی لەبەرا نەما نازانم
بۆ ؟ ئەم کۆڵانە بۆ کوێر بۆتەوە دەرگاکان بۆ چاوێ ناتروکێنن
شەو سەراپا هەرشەو جوانترین شەوە بۆ ئەوین کەچی دڵمان
سەفەری کرد
جوانترین شەوە بۆ ناسینەوە بەڵام چاومان لە فرمێسکا خنکا
دواهەنگاومان نابینا بوو پەنجەکانمان هەڵوەرین
درەختەکان هەناسەیەکیان لەبا هەڵکێشا
تنۆکێ باران بەردێکی ماچ کرد و لەگەڵ چەمێکا سەری
هەڵگرت ، چ مەملەکەتێکە دڵی تەزیوی من و تۆ
وا لەناخیا ئەم خوێنە گڕی گرتووەو هێور نابێتەوە
من بەم هەناسە ساردانەوەهەنسکە تەڕەکانی
تۆم پێ وشک نابێتەوە
سەبری هێنا زەمەنێکی تریش سەبرکە
لەگەڵ جەختا بەڕێکەوە
تۆ عەسرانە دوای پیاسەیەکی سارد
شان ئەنێی بەدارتێلێکەوەو پڕ پڕی لە چاوەڕوانی

لەتەنیایی خۆتا لێوانێک لێواو لێوی
وەک ئاگری بەر ڕەشەبا ئارامت لێ بڕاوە
بەلاتەوە زۆر سانایە لەناخەوە بگریت
بەڵام جەخار کەناتوانی لە قوڵایی بیری ناختەوە
جامێک پێکەنینم بۆ دەربێنی
ڕۆحت مەکرۆژە ئەم وشکەڕێگایە ڕوخسەتی شەپۆلەکانی ئەوێ
.. وەرە با ڕۆحمان شەتڵ کەینەوە
تا قوڕی سەر گڵۆپی دەرگاکان ئەشۆرێتەوە
ئەزانم ئەمە وەرزی ئێمە نەبوو
وا کەوتینە وەرزی پێنجەم
جێی من و تۆ نابێتەوە ئەزانم لەگەڵ دەستی خۆتا دەرگاکە لەمن
داخە نەبا بیرەوەرییەکان وەکو مناڵێک
بەشوێنتا وڕگ بگرن گۆچانەکەش بۆ من جێبێڵە
پێ ئەچێ چاوم بکوژێتەوە
منیش لە ئاوا بوونی چوارشەممەیەکدا سەرخەوێ لای زێوانە
پاکییزەکان ئەشکێنم بەڵکو خوایە سەردەمێکی تر بەئاگا بێمەوە
سەردەومێکی تر بەئاگا بێمەوە

# دیدارێك لەشەقامی شیعر

××× ××× ×××

کەشەو داهات هێشتا شەقامی شیعر خۆت لە ڕووناکی پڕ نەکرد بوو
بێزاری یەک بە بێدەنگی بەناخمدا ئەهات و ئەچوو
منیش وەکو شەوانی زووم
پێ هەنگاوم بەرەو باڵی شەقامەکەی سالم ئەبرد
دڵم تاسەی دیدارێکی هاوڕێی خەمی شەوی ئەکرد
هاوڕێم تۆش هاتیت بێدەنگیت شکاند
شەقامی شیعریش بۆ ڕێبواری شەو بریسکەی ئەهات ئەبووە چراخان
هاوڕێم مەپرسە شەوانە منی تەنیا
لە ئامیزی شەقامێکی تەنیا تەنیا
وەکو مەلێک چۆن بەسەر چڵێک دێت و دەچێ بۆ لێک نابینەوە
هاوڕێم ماشێنی ئومێد لە عومری منا هات و جێی هێشتم
تازە من هەرگیز پێی ناگەمەوە
بۆیە وا ئەمشەو نیگام نوقومی نەخشەی سەر پشتی گەلایە
ئاوێنەی تێڕوانینم ، سنگی نەرمی دەریایە
حەرفی شیعرێشم ، نم نم بارانی خوایە
گۆرانی نوێشم هاوارێکی نیوە شەوی بێ هانایە

# مەهتاب

چراکان داگیرسێنن
تا شەوەزەنگ سەرنجی ڕوون دانەپۆشێ
باهاواری کەنارییەکان نەغمەی سەربەستی بپۆشێ
باڵندەکان .. لەباڵ مەدەن
ئاسمانی بەرین ڕێتان ئەخواتەوە
تەنیا پۆشی هێلانەکان باوەشتان بۆ ئەکاتەوە
نازی گەرمی بێچووەکانتان
دنیای خەمتان ئەشواتەوە
ئەی مەهتابی پڕ ئەمەل ، نیگا ناکەیتەوە
شەوقی پرچی تەڵایی بۆ ناخەیتەوە
چەن تەورەکان تیژو دەمەساو بێ
نایوەرێنێ پرچی ئەگەر گەشاو بێ
تاکو مەهتاب شەوقی هیوا بڕژێنێ
زیاتر عاشق خەمی لە دڵ دەمرێنێ

# شەپۆلی خەم

وردیلەکەم ئەشەو من و تۆ بێکەسین
لەکەناری دەریای خەما دوو نەورەسین
وەرە ڕۆڵە هەناسەکەم تاسەی کەیلم مەتورێنە
ئەستێرەی ڕێنیشاندەری شەو مەدوێنە
وا باوەشم بۆت کردووە بە هێلانە
کزەی هەستم بۆ ئەم شەوەت ئاگردانە
زەمەنی شووم چەن شەوێکە
تەمەن ئەڕواو لەگەڵ خۆیا ڕایئەماڵێ
لێم مەپەرسە بۆ بەلەمی خەونەکانمان
لەنگەر ناگرێ لەم ئازارە
لێم مەپرسە ساتی خەوە بۆ چرای ئێمە بێدارە
ئەمە چیرۆکی خەمێکە لەم هەوارە
لەبەر تیشکی چاوەکانتا ئەینوسمەوە
ئەو دەمانەی هەتاو دەرکەوت
منیش بۆتی ئەخوێنمەوە

## ملوانكە

لەدوورەوە ملوانكەكەت بریسكەی دێ
خۆ نازانم چی نوسراوە!
بەڵام دیارە یەكەم حەرفی ناوی منە
بەگەردنتا هەڵواسراوە!
چۆن ئەم حەرفە باڵابەرزە
بەكەلەپچەی ملوانكەكەت دیل كراوە؟
كچێ وەرە حەرفەكانی تریش بەرە
چونكە لای خۆم
بەبێكەسی و بەشێواوی بەجێماون

# شەو

بۆ کوێ ئەڕۆی بەم شەوە
وا دنیا ڕووی لەخەوە
سەیری شار کش و ماتە، هەموو شتێ بێڕەنگە
شەقامەکانیش نوستوون کوچەو کۆڵان بێدەنگە
پرشەی نیگای چاوت پڕ نەشئەی دنیامە
ئا بەم شەوە تارە دڵیش بێ ئارامە
تو ئیلهامێک کە تۆ بۆ شیعرت هانی
وەرە بمخەرە ناو دنیای گۆرانی
لەگەڵ یادەکانتا ئێشکگری شەوم
ئەی نەسیمی خۆزگەم بەدوریت ناسرەوم
ئەی نازانی هەرتۆی ڕۆحی شیرینم
پەیامی بەهاری جوانی و ئەوینم
لەکەناری دەریای خەما واشەکەتە ئەژنۆم
بۆ دیدارێکی تۆ من وێڵ و سەرەڕۆم
مەڕۆ بەجێم مەهێڵە فریشتەی مەبەستم
چراخانی دیدەو سۆزی هەڵبەستم

# پاییزه کۆچ

ئەڕۆی .. ئەڕۆی
لەگەڵ شەوانێکی خەما
لەگەڵ ڕێگایەکی تەما
شەوقی ژیان چرایەکی بێ پەیمانە
بۆ کوێ ئەڕۆی
لێرە دڵمان دوو باڵداری ئێوارانن
تاسەی غوربەت وەک ڕەهێڵەی پاییزانە
مەڕۆ نەبا ،هەورێک لە ڕێ
دڵت پڕکا لە گریانی
ئەوسا لەبەر فرمێسکی ئەو
بەگریانی من نەزانی

# دەرگایەک لە بەفر

ئەترسم بەیانییەک..
بەر لەگەڕانەوەی خۆری ماندوو لەسەفەری شەوێک
دەرگای ژوورەکەشم بەنهێنی سەفەری کردبێت
ئەترسم گەڵایەک بەر لەوەرینی
سێبەرەکەی خۆی بەجێهێشتبێ
تۆ تەماشا لە پشتی هەموو دەرگایەکی داخراوەوە
دڵێک شکاوە.!
لەگەڵ ئاوێنەکەتا مەدوێ ،
چونکە بەرگەی شکانێکی تر ناگریت ،
کە ڕۆح بەر لەمردنی جەستە
جەستە بەجێبێڵێ ..ئیتر شیرینی ڕۆح لە کوێدایە
من دڵم دەریایەکی بەستووەو
خەم سەمای لەسەر ئەکات
تۆش چاوت دەریایەکی دەمەو مەغریبەو
هەتاوێکی گرتۆتە باوەش
بەڕوومەوە پێمەکەنە

ئیتر لێوی وشکەڵاتوم چرۆی زەردەخەنە ناگرێتەوە
واز لە موتوربەکردنی پێکەنین بێنە
من ئێواران شەقامێکی سەلێشێواو ئەمباتەوە
کۆلانێکی بن بەست بەخێر هاتنەوەم ئەکات
کە پەنجەرەکەم باوەش بۆ با نەکاتەوە
ئیتر چۆن بتوانم بە زمانی شەماڵ بدوێم
کێ ئەتوانێت هەورێک بێنێتە پێکەنین
کە چاوی پڕبێت لە فرمێسک
راستە من و تۆ دوو دڵۆپ ئاوین
بەڵام تۆ بەسەر بەفرا باریویت و
منیش بەسەر پشکۆیا
تۆ بەمناڵی کە ئەگەڕایتەوە هەموو
چینی دیوارەکانت ئەژمارد ،
تا ئەگەیشتیتە بەر ماڵی بەختەوەری ..
کەچی ئێستا ئەرشۆیت و ژماردنی
چینەکان ئەدەیتە دەست پلوسکەی
چۆڕاوگەیەک

تۆ ئەزانیت شەڕی بەفر و هەتاو لەوەدایە
هەتاو ئەیەوێت دنیا ڕەش کاتەوە
شەڕی بەهارو پاییز لەوەدایە
بەهار ئەیەوێت مەرگی بۆن و ڕەنگی خۆی نەبینێ
تۆ ئەڵێی بەهێزترین بوومەلەرزە
لەو بایە بەتین تر نییە کە گەڵا ئەلەرێنێتەوە
تۆ ئەڵێی سەرهەڵگرتنی ڕووبار
لە ڕقی بارانێکی خۆڵاوییە
لێم مەپرسە لەقەسیدەیەکتا ،
چەن حەرفت سەفەری کردووە
لە گۆرانییەکتا چەن مۆسیقای غەریبی تیایە
ئیتر گۆرانی نوێت لەمن نەوێ
من ئەگەر کەشتی سەرهەڵگرتوش بم
شەپۆلی ئەم دەریای عاتیفەیە هەر بۆ کەنارم دێنێتەوە
من ناتوانم لە ڕووبارێک بپرسم
چۆن مانگەشەو لەباوەشتایە
تۆش بێباکانە سەر هەڵئەگریت !!

# بڕ کاسە

وائەمشەویش هاوڕێی خەمم
چونکە جەژنم بێ کاسەیە
لەسەرابی دەرونیشما گەردەلوولی هەناسەیە
هەرچەن ئاسۆی جەژنی جوانیش
خۆی ڕۆژێکی دەم بەگوڵە
بێکەسیخۆم وردیلەکەم ماڵی بابت بێ نوقوڵە
کاتێ ئەڵێی ...
ئەرێ بابە کوا پۆشاکی جەژنی پارم
هێندەی تر کڵپە هەڵئەسێ لە دەروونی پڕ ئازارم
خۆ ئەزانم ئەم خەمەی من
لەئێستاوە تۆش ئەینۆشی
بۆیە دڵت نایە بڵێ
ئەرێ بابە کەی پۆشاکی تازە بەباڵام ئەپۆشی؟

## ڕەشتی نێرگز

چاوەڕێی شنەی شەماڵی لای تۆم
مەست و خەمباری زەمانەی ئەمڕۆم
ئەگریجەت وێڵە بەدەستی باوە
گوڵ لە جوانیتا سەری داناوە
لە چاوی تۆدا عەشقم ئەبینم
بەتیشکی چاوت ڕووناکە ژینم
تۆی کانی ڕوونی باخی ئەوینم
سەرنجت ئاهێک ئەدا بە ژینم
هەر تۆی نیگاری دەشتی نێرگزم
کزەی ئێوارەی مەستی پاییزم
تەنیاو پەشێوم خەمی تۆ دەخۆم
وەک بای ئێواران وێڵ و سەرەڕۆم
چاوەڕێی ڕەنگی نەوبەهارانم
تاکە ڕێبواری ڕێگەی بارانم

# ڕێبواری نامۆ

ڕێبواری نامۆی بێ سەرو شوێنم
بەدەم ڕێگاوە هەر خۆم ئەدوێنم
ڕوخسارم شێوەی ماتەم ئەنوێنێ
نیگام گوڵێکی بەهار نابینێ
لەسەر دووڕیانی هات و نەهاتم
چیرۆکی خەمی پڕ بەسەرهاتم
چاوم بەندەری فرمێسکی ئاڵە
بادەی خۆشبەختیم ژەهرێکی تاڵە
ئەستێرەی دووری بێ ناونیشانم
تەعبیری نیییە خەوی شەوانم
تەنیایی و خەڵوەت ئەشکی بەتاوم
دڵەی غوربەتی خەم لێئاڵاوم
دیاری تارم وێرانەی خەمە
هەنسکی تەڕو ئەشکی ماتەمە

## نەورەسی خەندە

ڕێی ئێوارانم خامۆش و لێڵە
سەرنجم وەکو هەنگاوم وێڵە
کەشتی ئومێدم ڕوو لە کەنارە
دڵم ئاوێتەی تەم و خومارە
تاڤگەی تەماشام پڕ لە ئەسرینە
ئەشک لە چاوما هاژەی بەتینە
لە وەرزی عەشقا خۆزگەم وەریوە
نەورەسی خەندەم لە گوڵ تەریوە
سەرم لە ڕەنگی بەفرا دایە خەم
ڕۆژی ساماڵم بوو بەهەورو تەم
بەلەمی عومرم ڕوو لە زریانە
وا ئاوا ئەبم ئا لەم ژیانە

تەنیا ڕۆژێ بوو خۆرێ لە چاوما
ئەدرەوشایەوە وەک هەتاوی گەش
لا پەڕەی خەندەم پەڕەی گوڵێ بوو
ئێستا کەوتۆتە بەر گڤەی باڕەش

×××

وەکو ڕووبارێک دڵی ئاو ئەدام
تا سەحرای ژینم بیر بەرێتەوە
ئێستاش بە تاڤگەو شێوەی بەفرینی
گوێم بە ناوی ئەو ئەزرەنگێتەوە

×××

هەروەکو باخێک کەوتە ڕێی ژینم
گوڵی بەهاری نەکردە بەرم
بەڵام داخەکەم بەفری خەمی ئەو
لەگەڵ هەتاوا دایکردە سەرم

# زەردەخەنە

من ناونیشانم وڵاتی بەفرە
کەچی ڕێی ژینم دەشتی سەحرایە
پەنجەرەی چاوم تەم دایپۆشیوە
لەچلەی هاوینیش هەتاو لێی نایە

تەماشای چاوی تەماویم مەکە
تەنیا فرمێسکی باران ئەبینم
بازەردەخەنە نامەی لێوم بێ
لە خەم زیاتر کێ دێتە شوێنم

لاپەڕەی سپی کە تیای ئەنووسم
لەبەر چاوی من ئەڵێی بیابانە
شەقامی چۆڵی ڕێی گەڕانەوەم
هەنگاوم ئەبا بەرەو وێرانە

لە ناو ئاوێنەی عومری ڕابردووم
بایەک هەڵی کرد سیمای شێوانم
ئای پەشیمانم ئا لەو ڕۆژانە
زەردەخەنەیەک تۆی پێ ناساندم

# تەلاری عەشق

بەڕووی نازەوە ئاوێنەی چاوت
تیشکی سەرنجی ئەگرێتەوە چاوم
خۆ من تەلاری ناونیشاندار نیم
بۆچی ئەپرسی لە شوێن و ناوم

من کۆشکی بەرزی پڕ ئاوێنە نیم
هەر لە دوورەوە بمناسیتەوە
شیعری غەریبی دووورە وڵاتم
مەگەر بەگریان بمنوسیتەوە

من ئەو گەڵایەم کە هەڵوەریوم
دەستی خۆم بەردا لە چڵ بەجارێ
قەد باوەڕناکەم چڵێکی تر بێ
بمکاتە سێبەر بۆ باڵای دارێ

# ژین

لەسەر گۆماوی ژینی ڕابردووم
وەک گەلای وەریو وا ڕاوەستاوم
ئەڵێی بەلەمی دەستی زریانم
هەر بۆ کەنارێک ئەسوتێ چاوم

×××

چرای شەوگارم ئەستێرەیەکە
دواین هەناسەم شیعرێکی مەستە
لە وەرزی ئاڵی زەردەخەنەدا
دڵەی غەریبم بەخەم پەیوەستە

×××

دوا ڕێگەی ژینم ئێوارانێکە
ڕەشماڵی شەوگار لێم دا ئەپۆشێ
گەرچی دوا وێسگەی عومرم تاڵییە
شیرینی ژیان هەر پێم ئەنۆشێ

# یار

ئەستێرەی بەختم مەخوێنەرەوە
ژیانم وەکو چاوی تۆ ڕەشە
بەڵام تەماشام لەودیو هەورەوە
وەکو خۆرەتاو ڕووناک و گەشە

×××

گەرچی سەرابە دڵی خامۆشم
بۆ دیداری تۆ پڕ گوڵی ئاڵە
من لە خەم زیاتر هیچ کەس ناناسم
هەناسەو ئاهم شنەی شەماڵە

×××

کۆچی ئێوارەم ئەرخەوانییە
بەڵام شەو یادت دائەگیرسێنم
با وێرانەبێ ژووری خەیاڵم
لە ڕێتا گوڵی خەندە ئەچێنم

# دیداری هەینی

ڕۆژێکی سەختی پڕ تەم و خومار
شوێن پێی من لە شار کوێر ئەکاتەوە
ئەو ڕۆژە چیتر بۆ نامەی عاشقان
ئەستێرەباران داناکاتەوە

ئەو عومرەی ڕابورد بوو بە ئەفسانە
تاڵ و شیرینی وەکو یەک وایە
وەک هەتاوێکی دەمەو ئێواران
چەن خۆی شیرینکا شەوی لە دوایە

ئای لەم ڕۆژانە چەن بێ وەفا بوون
خۆشم نەمزانی چۆن هاتوو ڕۆشتن
ئەو هیوایانەی کە لە دڵما بوون
هەر بەم دەستانە زەمەن پێی ناشتن

چاوی نەناسێک وەک حەزی شیعر
هیوای وەریوم ئەخوێنێتەوە
بەڵام نازانێ لە پاش کۆچی من
مردن کۆچی ئەو ئەنوسێتەوە

ڕۆژێکی وا دێ بارانی بەهار
شیعری سەر کێلم بشۆرێتەوە
بەڵام پێی ناکرێ ئاوازی شیعرم
لە زاری عاشقان بیر بەرێتەوە

لەسەر ئاسمانی هەواری تەنیام
پۆلە باڵندە هەر ئەجریوێنن
لەگەڵ دیداری ڕۆژانی هەینی
ئیلهامی شیعری تازەم بۆ دێنن

# شەقامی پیرەمێرد

ئەی ئەو شەقامەی کە ساڵانێکە
هەنگاوەکانم ئەگریتە باوەش
من نازانم چۆن وەسفی جوانیت کەم
ئەبیتە جێژوان هەزاران چاوگەش .

درەختەکانی ئەمبەر و ئەوبەر
وەک عاشقی مەست لەیەک ئاڵاون
بۆ شەکەت بوونی ڕێبوارانی ڕێ
چەتر و ساباتی بەر خۆرەتاون

لە داری مەلیک تا ئامێزی شار
باڵای بەرزی تۆ هاتۆتە خوارێ
دەمەوئێواران هەر وەکو باران
عەشق لە باڵای تۆ دائەبارێ

# چرە

چۆن چرا هەڵکەم بۆ عەشقێکی تر
کە خۆرێ لەناو چاوما ون نەکا
چۆن تۆ لەبیرکەم ڕوخسارێکی تر
بۆ ماڵی دڵم وەک تۆ سەرنەدا

بۆ خەم بەڕێکەم ئەو دەمانەی کە
دووریت ئەبێتە پشکۆی خەیاڵم
لەبیرم ناچی هەر لەبەر چاومی
بەیادی تۆیە خەم ڕائەماڵم

ئەو ئێوارانەی عەشقمان ون کرد
شەستە بارانێک لێی دانەکردین
ئەو گەڵایانەی (با) ئەیوەرانن
ئێمە لە شوێنی ئەوان ئەمردین

## گریانی هەور

پەڵە هەورێکی دڵ پڕ لە گریان
وەکو چاوی من دایکردە باران
ئاخۆ ئەم هەورە بۆ کام خەم ئەگری
بایەکی هێمن فرمێسکی ئەسڕی
چەخماخەی بەتین وەک هەنسکی من
ئاسمان لەچاوما وەک دەریای بێ بن
کەس ئەم گریانە ناخوێنێتەوە
خاک فرمێسکی کەس نانوسێتەوە
ئەو خۆرەتاوەی ڕۆژان ئەمبینی
هەورێک ئەبینم لە جێی ئەوینی
گریان سەبوری دڵی من ئەدا
ئاخۆ بەدڵی هەوری چی ئەکا
ئەی هەور بگری دوور لە پێکەنین
بەگریانی تۆ جوانە سەر زەمین
خۆزگە گریانی منیش وەکو تۆ
خاکی پڕ ئەکرد لە لالەو و شەوبۆ

# کەژ و کێو

له دوور ئەڕوانی کەژو کێو دیاره
باڵای نەمامی سەر ئەو ڕووباره
دەشت و هەردوو دێم بە گوڵ ئەنازن
بۆ ڕێبواری ڕێ دڵ پڕ لە ڕازن
شەونم باریوه بەسەر ڕووی گوڵا
شنە بایەک دێ بە دەووری چڵا
جێژوانی مەلان باخ و دەوەنه
سەراپا ڕێگا سایەو چەمەنه
ئەو دیو لوتکەی شاخ تاڤگەی شەتاوه
پۆلێ مەل دیاره لە باڵیان داوه
سەرپۆشی بەفره بەسەر لوتکەوه
بەو خۆرەتاوه سەر ئەنێتەوه

# نوری عەشق

جاران عەشقی تۆ خۆری هیوام بوو
تروسکەی ڕوونی نوری دنیام بوو
بەڵام وەک هەورێ چۆن با زوو ئەیبا
بەڵێنت لە ڕێی وەفا خۆی لادا
کانیلەی ڕازی ئەم عەشقە پاکە
بەدەستی تۆیە لێڵە ئێستاکە
دڵم کردبوو بە هێلانە بۆت
بوو بە ئاگردان شێواندت لە خۆت
برۆ وەک ڕێژنە لای من مەبارێ
تازە بۆ دڵم بووی بە ئازارێ
ئێتر نابینی بڵێم وەرەوە
لە دڵما شێوەت هاتە دەرەوە

# جودایی

دەبا بەس بێ دەردی دووری و جودایی
بەدوورمکە لە ئازاری تەنیایی
چاوەڕوانیت بۆتە خولیام هەمیشە
لە ناو دڵما خەم دایکوتاوە ڕیشە
هەناسە و ئاهو دیدەم بەتۆ بەخشی
کەچی تۆ عومری گەنجیم پێ ئەفرۆشی
دەستم بگرە بەرەو دنیای مەستانە
دەپێم بڵێ تەنیایی کەی ژیانە
وەرە تۆی فریشتەی ڕازی ئەوینم
هەر بۆ تۆیە هاودەمی خەم و شینم
دڵم کەیل و بێ ئارام و پڕ ژانم
لە دووری تۆ ئاوارەو سەرگەردانم
بۆچی نایەی بۆ دیدەنت پڕ تاسەم
تەنیا هەر تۆی کزەی دڵ و هەناسەم
میهرەبانیت سەفاو مەیلی ئەوینە
کێ وەکو تۆ نیگای هێندە شیرینە

## سەفا

ئەی سەفاو ئاهی خۆشبەختی جاران
بۆ لێم ناپرسی وەک جەفاداران
گوڵی تەمەنم بۆ تۆ هەڵوەری
تۆش لە ئەوینت مەمکە بێ بەری
یادگارییەکانت ڕۆخی دەریایە
هەر شەپۆلێکی یادی تۆی تیایە
دیارم بێ تۆ وێرانەی خەمە
هەناسەم ئاخ و دڵم ماتەمە
ئێستاش دڵ مەستی عەشقی جارانە
ئەشکی تەنیایم نمەی بارانە
ئیتر بە کزەی وەرزی دووری تۆ
من ڕێبوارێکم وێڵ و سەرەڕۆ
وەرە ڕۆشنکە دیاری تارم
سەرت هەڵبێنە خۆری ڕۆژگارم
خواستی دڵی تۆ چی لە من ئەوێ
خۆ من بە بێ تۆ ڕۆحم ناسرەوێ

# بارانی شەو

ئەمشەو نمەی بارانە
ئەشکی هەوری ئاسمانە
وا ئاوازی باوبۆران
سرووده بۆ ئەمشەومان
تنۆکی ئاڵی باران
ماچ ئەکا لوتکەی شاخان
ئەمشەو نیگای ئەستێرە
ناڕوانێ بەرەو ئێرە
تاوە تاو خۆش ئەبارێ
بەسەر شانی هەوارێ
هەوری ڕەش ئەشواتەوە
ئاسمان ڕوون ئەکاتەوە

# خەم

شەوانە دنیا تارە
حەسرەت و لێو بەبارە
لە ژێر پۆلیٚ ئەستێرە
خەم میوان ئەبێ لێرە
ئاهو ئەشکی تەنیایی
لێو ڕێژە بۆ جودایی
بە سۆزی دڵەی کەیلم
چاوباران و پڕ سەیلم
تۆی کارێزی ئەوینم
سەفاو حەسرەتی ژینم
وەک شنەی با وەرە لام
ئەی خۆرەتاوی دنیام
کێ وەکو من لەبەر تۆ
تەمەن ئەدا بە فیڕۆ
ئەوەندە هاتم بۆ لات
بووم بە سێبەری باڵات
خەرمانی هیوام هەرتۆی
تازە لە پاش چی ئەڕۆی

## ڕێژنە

هەڵاڵە بووکی بەهار
چاوگەشی دەشت و کۆسار
وەرە با لەم سەیرانە
بدوێین بە ئازیزانە
ئاوازی من هاژەی ئاو
سەرنجی تۆش خۆرەتاو
نیگات ڕێژنەی بارانە
دائەکا لەم سەیرانە
وەرە کزەی هەناسەم
بۆ مەیلی تۆ پڕ تاسەم
با لەنێو باخی بەهار
بۆیەک بژین بێ ئازار

# دیدارێ

لەپاش چەن ساڵ خۆشەویستی
پێت نۆشیم بادەی سەر مەستی
کە ئەمبینی چۆن ئەتوانی
وەک غەریبێ بۆم بڕوانی
دنیایەکی سەیرە ئازیز
ئەڵێی نەتناسیوم هەرگیز
لە سزای عەشقم ناترسی
بۆیە لە ئاهم ناپرسی
بە غرووری ناهەمواری
ئەیسەلمێنی خەتاکاری
لێواولێوی کاسەی دڵم
غەرقی خەمی تۆیە گوڵم

## بەرەو ئێوارە

وا ئێوارەیەو ڕوخساری تەنیام
لە ئامێزی کەس خۆی ناگرێتەوە
هەنگاوی وێڵ و ڕێی بێ مەبەستم
وەک وەنەوزی خەو سەر ئەنێتەوە

سەرنجی شێت و دڵەی سەڕۆم
غوربەت دەروازەی لێ ناکاتەوە
تەماشای ماندووی بەرخۆرەتاوم
بۆ ژێر سێبەری کەس ناباتەوە

وا ماسی ڕۆحم لەم گێژاوە
بۆ دواهەناسە هاتۆتە کەنار
لە باخی عومەری وشکەڵاتوما
گەڵارێزانە بۆ دەشت و کۆسار

هەنسکی تەڕو بارانی چاوم
ئاگر لە دڵم بەر ئەدەنەوە
سێبەری خەستی دەمەوئێوارە و
شیعر باوەشم بۆ ئەکەنەوە

## خۆر نشین

چاوی پڕ نیگای هەتاوی زێڕین
لە شار ناتروکێ هەتا خۆر نشین
باوەشی ڕێگا بۆ تاسەی یاران
ئەبێتە بەهەشت دەمەو ئێواران
گۆیژە ئەڕوانێ بۆ ئامێزی شار
جار جار شنەی باو گەڵا دێنە خوار
درەختی لاڕێ ڕیزیان بەستووە
ئەڵێی بۆ ئاهەنگ دەستیان گرتووە
پەیکەری بەرزی باڵای منارە
تامزرۆی مەل و پۆلێ باڵدارە
ئێشگری شەو بۆ ئەم هەوارە
چیای سەربەرزی چوار دەوری شارە

## نزه

دەمەو ئێوارە خۆری ڕووی تۆ هات
دنیای ئەوینی ڕۆشن کردمەوە
هەرچی ڕابردووی یادگاریمە
چاوی ئەفسونیت بیری بردمەوە

وەرە هەناسەکەم باڵێت دوور نەبم
چرای ئەوینی دڵ داگیرسێنە
لەباخی عەشقی چاوەڕوانیما
وەک تەرزە بۆ گوڵ خۆت دابارێنە

بەڕووی نازەوە دڵم مەشکێنە
ڕێژنە بارانی سەرنجت بێنە
من ڕێبوارێکی ماندووی گۆنای تۆم
لە کانی عەشقا تینووم بشکێنە

## هاوڕێ

هاوڕێ گەر مرم جەستەم هەڵوەری
کە دوادەوارم هەڵدا لەسەیوان
بۆ شەکەتی ڕێت کە سەردانم کەی
هەر سێبەرم بۆت وەکو ئەرخەوان

کەڕیزێ مۆم و کزەی هەناسە
بسووتێ و بۆنی بگاتە ئاسمان
ئەو کاتە گەردوون ئەنوسێ مردن
بۆتە باعیسی لەیەک دابڕان

تا لە ژینا بووم نەمدی لالەزار
بمرم گوڵاوی چاوت ئەبارێ
ڕۆحم لە ئاسمان گەر ئەستێرەش بێ
بۆ دیداری تۆ دێتەوە خوارێ

# سەرگەردان

سالآنێکە بانگم ئەکەیت، هەتا ئێستاش من بێ ناوم
ناونیشانی چی بەم بەتۆ، لەلای خۆشم نەناسراوم
چۆن ئەتوانی من بدوێنی، خۆلە ژینما قەت نەدواوم
زەردەخەنەی چی بناسم، بەئەشکی تەڕ گۆشکراوم
لە جەژنی کام ڕەنگا دیاربم، ڕەنگی ساردی نەبینراوم
وێنەی خۆم چۆن بناسمەوە، لەئاوێنەی تێکشکاوم
دوور ئەڕوانم بەڵام چیبکەم هەردوو چاوم ون کردووە
جەستەم ئەڵێی پەیکەرێکە، چونکە دڵمی تیا مردووە
چی لەخۆری ئاسمان بکەم، خۆ من دایمە ڕۆژم ڕەشە
تەنیا لەڕێی چاوەڕوانی، بینایی من ڕوون و گەشە
وەکو مۆمێک غەرقم لەناو نمەی ئەشکا بۆ سووتانم
دەسا چیبکەم کەمن ماندووی، سەردەمێکی بێ پەیمانم

# بارگەی خەم

بارگەی خەمم هەڵگرت و هاتمەوە بۆ شارەکەم
هاتم بەرەو دیباری شەنگی کەسو کارەکەم
بۆ باوەشی بەسۆزی دایکە دڵ سووتاوەکەم
تاکو بزانێ چەندە بەسۆیە ئازارەکەم
هاتووم وەکو شەماڵێک چڵ و گەڵا بدوێنم
پاییزی غەریبی، دڵ بەجارێک هەڵوەرێنم
کەمن نمەی باران بم، ئێوەش ئاوێنەی باخمن
هەرچەندە لێتان دوور بم، هەنسک و ئاهی ناخمن
دڵم پرسەخانەیە، سەرم بەفری زستانە
هەمیشە خەم لەچاوما باڵاترین میوانە
وەک باڵندەی لانەواز .. تەرەو بێ ناونیشانم
چەن شیرینە کە دەڵێم، من خەڵکی کوردستانم

# هەور

ئای لە سیحری چاوەکانی منی خستە دەریای گومان
هێڵی دەستم دایە دەستی ڕێبوارێکی وەفا نەزان
جاران ڕۆژم ئاوێنە بوو، دەریایەک بوو بۆ شەپۆلم
بەڵام وەکو گەڵای پاییز ئێستا غەرقی خاک و خۆڵم
دڵم دایە دەستی هەورێک هەتا باران ژێرکاتەوە
وەکو خۆری دەمەو مەغریب چاوگەشانە بڕواتەوە
بریا هەستی خۆم بدایە بەپەیکەرێک بێ ڕۆح و گیان
نەک بەڕۆحێک پڕاوپڕ بێ ، کەتیای نەبێ هەست و ویژدان
خۆزگە چاوم گەڵا بوایە، تا پاییزێک هەڵوەریایە
ئیتر گریەی هیچ هەورێکم، بەچاوانی خۆم نەدیایە

## دڵئاوێنە

وەرە ئەی دڵئاوێنە، دڵی پاکم بدوێنـە
تەنیا هیوام بەتۆیە، چرایەک داگیرسـێنە
دڵم کەوتۆتە لەرزە، ئەڵێی هەرمێی بەربایە
بوم بەمەمی ئالانێ دایمە شــەو لەخەومایە
عەترو گوڵاوم ناوێ، تـــا ئەو گوڵم بۆ بێنێ
ئەڵێی جــەژنی نەورۆزە دڵم دائەگیرسێنێ
چرپەو دەنگـــــی هێمنی تارو هاواری سازە
هێندە دەرونی پـــاکە ، نەغمەیە پڕ ئاوازە
ئەڵێی ڕووبارو ئاوە زوو دەڕوا لەبەر چاوم
خۆری گەشی هیــوامە بەڕوناکی ئەو ماوم

# سێبەرێکی ماندوو

ئێوارانێ دڵی تەنگم ئەڵێی هەرمێی بەر بارانە
سێبەرێکی وەک خۆم ماندوو بەشوێنما دێ لەم ژیانە
بەچاوی پڕ نیگەرانم شێوەی خۆشم ناناسمەوە
لەتەماشای هەموو خۆرێک ئاوابوونێک ئەبینمەوە
ئەی ئەستێرەی شەوی تارم سەرهەڵبێنە لەم دیبارە
لە دوریتا خونچەی باخم، بێ خەندەیەو لێو بەبارە
تاوێک وەرە وەکو باران چۆن دەبارێ بەسەر گوڵا
تاسەی کەیلم بتۆرێنە دەی ببارێ بەسەر دڵا
بۆیە هێندە تۆم خۆشئەوێ هەر خەمباربم لەهەناومای
ئەڵێی شەپۆلی فرمێسکی هەر کە دەگریم تۆ لە چاومای
هەنسکێکی لە گەرووما لە هەناسەم نابیتەوە
وەکو بەفری چلەی زستان بە سووتانم ناچیتەوە

خۆشەویستیت لەچاوانما
دەریایەکی بێ سنوورە
ئەو دەمانەی لەتۆ دوورم
هەموو دنیا لەمن دوورە
خۆشەویستیت بەهارێکە
هەزار گوڵی خۆزگەی تیایە
تۆ ئێستاکە هەناسەمی
بێ تۆ ناژیم لەم دنیایە

# دێوانە

دێوانەم بۆ نیشتمان ، دێوانەم بۆ کوردستان
بۆ دییارو هەوارو کانی و سەرچاوەی ژیان
من عاشقی وڵاتم ، عاشقێکی سەرمەستم
غەریبی وشکی کردووم ، بەڵام بۆ ئەو بەهەستم
من بەخۆری ئەو دەژیم، ئەو گوێ ی لە ناڵەی منە
گەرچی ناونیشانی من ، هێشتا ماڵێکی ونە
خاکەکەم ئاوێنەیە ، ڕووی خۆمی تیا ئەبینم
هەموو دنیا باخچە بێت لای ئەو گوڵم ئەچێنم
خۆشەویستی من و ئەو وەکو شەماڵ و گوڵە
چەندە لەیەکتر دور بین ، نێوانمان تەنیا دڵە
فرمێسکی ئەو بارانە و ئەشکی منیش گریانە
هەر چاوم لە چاویا بێ پڕ خۆزگەم لەم ژیانە

# گوڵی لادێ

گوڵی لادێ .. دەم بەخەندە.. ئەی شاجوانی میهرەبانی
ڕوخساری تۆ ئەڵێی مانگە ، چونکە ئارایشت نازانی
ئاوێنەی تۆ کانی ڕونە ، کاتێ پرچت دائەهێنی
بەخۆر چاوانت ڕشتووەو بەشەرمەوە چاو هەڵدێنی
تۆ هەر گوڵ و باخ ئەناسیت ، دوور لە سیحری هەڵوەرینی
لەجێی زێڕو تەلاو گەوهەر خەو بە لوتکەو شاخ ئەبینی
جێژوانی تۆ بن دارێکە بەرامبەر بە کانی دێیە
ئەو بەهارەی تۆ چاوەڕێی تەنیا دیاری گوڵی پێیە
جوانی لادێ نیگا شیرین ، هەر لەخۆت دێ جوانترین ناز
وەک هەمیشە تۆی ئیلهامی دەنگی شیعرو نەوای ئاواز
کچانی شار هەرگیز وەک تۆ بەهای گوڵیان نەناسیوە
وێنەی خۆیان وەکو هەتاو لە ڕووبارا قەت نەدیوە

# گریان

لە ناو شوشەی خەیاڵمدا خەم وێنەی تۆم نیشان ئەدا
لەگەڵ هەموو گریانێکما توانای خۆزگەم لە باڵ ئەدا
نەمئەزانی ئەم سەفەرە وەکو خۆری لای ئێوارە
کۆچی تۆیەو خەمی منە لە دەروازەی ئەم هەوارە
چاوەکانم بوونە دەریا وا خەریکن ئەتوێنەوە
دەرگای هەموو گریانێکم بەیادی تۆ ئەکرێنەوە
چاوی سەوزی بەهاری تۆ وەکو لالە بەشەرمەوە
خەمی دڵی بۆ گوڵێکی دەم ڕەشەبا نەکردەوە
من چاوەڕێی سێبەرێک بووم تا لەگەڵتا ئارام بگرم
چیدی لەخەم دەست بەردەم و ئیتر ئەشکی گەشم نەسڕم
بەڵام داخم بەسەد داخم بوو بەساڵی هات و نەهات
بووی بەنمەی ناو دەریاچەی ڕۆمانێکی پڕ بەسەرهات

# ڕێگا

دەستەکانم پڕکە لە گوڵ ، هەتا دڵم بەم بەگیانت
چاوەکانم پڕکە لە ڕەنگ ، تا بەهار بم بۆ ژیانت
تاوێ ئاوی چاوانم بە ، ڕووناکی بە بۆ بینینم
لەسەر ڕێگەی تەنیایما هەوارێک بە بۆ ئەوینم
وەکو یەکەم نمەی پاییز کۆچی گەڵام بیر بەرەوە
وەرە گوڵێ بۆ دیداری عەشقی خۆتم ببەرەوە
لەگەڵ باران بانگت ئەکەم لەگەڵ گوڵا ئەتناسمەوە
چیرۆکێکی بێ پایانی لە ناخمدا ئەتنوسمەوە
من گەڵابم تۆ شەماڵی ، گەر بەستەشبم تۆ گۆرانی
لەشەوانی ئەندێشەما تەنیا هەر تۆ چراخانی
ئەی ئەستێرەی ڕێ نیشاندەر ، بەشوێن تۆدا شەپۆل ئەدەم
ژیان لەلام دەریایەکە ، گەر تۆ نەبی ڕێ ون ئەکەم

# دیدەن

گوڵاڵەی بەهاری .. شەنگی نێو هەواری
دایمە چاو لە ڕێگەم .. بۆ ساتێک دیداری

هەناسەی شیرینم .. ئەی خەندەو ئەوینم
بەتیشکی چاوانت .. ڕێگەی ژین دەبینم

ئاوازی بارانی .. ئەستێرەی شەوانی
چاوت خۆرەتاوە .. هەڵدێ بەئاسانی

ئەی تاسەی بەتاوم .. خونچەی پڕ گوڵاوم
من بۆ تۆ دەسوتێم .. بەخەم پەشێواوم

# خۆزگەی وەریو

که دەڕوانم بۆ ئەم ژینە چاوم هەزار خۆزگەی تیایە
بەڵام چبکەم کە بارانێک لەناو دڵما پەڵە نایە
کەس هێندەی من شەوانەی شەو نارِوانێتە چاوی ئاسمان
کەچی هەستی مانگەشەوێ دنیای نەکرد بە ڕۆژی جوان
من خۆرێکم نەناسیوە ، کە لە چاوما هەڵهاتبێ
سێبەرێکم لێ ون بووە ، بەشوێن خۆما هەنگاو دەنێ
ئەڵێی توانای بەساڵاچووم ، کە گۆچانێک دەستی دەگرێ
یا وەک مەلێکی باڵشکاو ، کە نەتوانێ تازە بفڕێ
خۆزگەم وەکو چرای خامۆش ، چاوەڕوانی داگیرسانە
هەتاوێکی سارد و کاڵی پاییزێکی تەمتومانە
لەناو باخی هەڵوەریوا ، کێ خونچەیەک ئەباتەوە
تا کلیلی دواخۆزگەی بێ و بەهارێکی پێ بکاتەوە

## دوا ئاواز

دیسان شەوە ، ئاخ لەم شەوە ، چاوی دنیا مەستی خەوە
هەر من نەبێ بیرو هۆشم ، سەوداسەری چاوی ئەوە

منالیی من کەی دێتەوە ، دەرگای خۆزگەم بکرێتەوە
دەرمبێنێ لەم غوربەتە ، ڕۆژی ڕونم هەڵبێتەوە

دەستم پڕ بێ لە گوڵ و باران ، چاوم دانێم لەسەر ڕێتان
بەخەندەوە دوا ئاوازم ، نەوایەک بێ بۆ غەریبان

لەدورییانی هات و نەهات ، چیرۆکێکم پڕبەسەرهات
لەتەنیایی تەنیاترم ، ژینم پڕە لە مەرگەسات

## یاقوت

بۆچی وەکو بەهار هاتی، کە پاییزێک سێبەرت بوو
بۆکوێ ڕۆشتی کە تەنیایی چەتری ڕێگەی سەفەرت بوو
کۆچت کردو بێ هەنگاوی ڕێگەی تازەت کەوتە پرتاو
واتئەزانی شەوەزەنگم هەتا بڕۆی بەرەو هەتاو
ئێستا لە دڵدەی کام کۆشکای تا دەروازەت لێ بکاتەوە
مانگەشەو بویت ئەتویست هەتاو باوەشت بۆ بکاتەوە
لەگەڵ بەفرا منت ناسی بۆ بێگەردیم سیاپۆش بووی
کەچی لەگەڵ کۆچی خۆتا پڕ دەریایەک خەندە نۆش بووی
هێشتا چاوت نەدا بەمن چاوەکانم کەوتنە بەر پات
مۆمێکی بێ پەروانە بوی لەتاریکیم دانەگیرسایت
پەنجەرە بووم بۆ ڕووناکیت دەروازە بووم بۆ ژیانت
وەکو باران بەخەندەوە نمنم دەهاتمە سەردانت

# ژیلەمۆ

هەرچەن لەپشکۆی خەما ئەسوتێم
بەڵام تەنیایی دڵی تەزاندوم
بەفرمێسکێکا خۆم دەناسمەوە
زەمانە خەندەی لە لێو تەراندووم

بەشوێن سێبەری خۆما دەگەڕێم
هەتا لەباڵام جیا نەبۆتەوە
دەترسم دڵم سەری هەڵگرێ
بچێتە جەستەی پەیکەرێکەوە

دایمە فرمێسکی چاوم دەبارێت
بەڵام کانیاوێک لەناخما نییە
بەو ناونیشانەی کەبانگم ئەکەن
خۆشم نازانم من ناوم چییە

## وێنە

سلێمانی دەڕوانێتە گەش خۆرێکی
هەموو ڕۆژێ لەپزێڕینە چیاکانی
لەژێر سەرپۆشی هەورەوە، بابان
سەرچاوەی شیعر و هونەرە دواهەواری میری
هێندە جوانە پاییزانیش شار دەبێتە بەهارستان
دوا ئەوینی عەولەسیس و لالەزاری مامە یارە
دەنگانەوەی ڕاپەڕین و نەورۆزێکی نۆ بەهارە
بەخوێنی گەش ئاودراوە شارو لانەی مەلیک مەحموود
ناگەن بەجوانی ئەم شارە هەزار باخی لالەو نەمروود
رازاوەی کەن ئەم هەوارە با شەوانی چراخان بێ
باسەرچاوەی کانێسکانی شوێن ئارامی ئاسکەکان بێ

## پەنجەرەی ڕوون

دڵی وەریو چیت لێم ئەوێ ، کە تۆ ئێستا ورد و خاشی
تازە لە دوای هەڵوەرینت ، شنەی بەهار چۆن ئەناسی
تۆ هەر وەکو گوڵی وەریو ، کە دابڕای لە ژیانت
چۆن لە هەورا خۆرێکی گەش ، دەڕوانێتە ناو چاوانت
دەستی لەرزۆک چۆن ئەتوانێ ، دڵی شکاو کۆکاتەوە
لە ژوورێکی تەمتومانا ، ڕووناکییەک هەڵکاتەوە
لە مەغریب و ئاوا بوونا ، هەتاو ئاوڕ ناداتەوە
لە شەوێکی پڕ گومانا ، کێ دەروازە ئەکاتەوە
دڵی شکاو ئەی سەرچاوەی کانی ڕوونی ئەشکی چاوم
نازانم تۆ لەمن ون بووی ، یا من لە تۆ بەجێ ماوم

## ڕۆژان

با بەس بێ چاوەڕوانی
بۆ بەحاڵم نازانی
چاوم لە ڕێگەی تۆیە
هەر تۆ بینای چاونی

××××

ڕێگەم هات ونەهاتە
ژینم پڕ مەرگەساتە
بەرگەی جودایی ناگرم
لەم دنیا خەرابـــاتە

××××

ئەڵێی مەلی کوێستانم
ئاوارەو سەرگەردانم
دور لە خۆری بەتینم
کوا ڕۆژانی جارانم

ئەی هەوارگەی ئەوینم
بێ تۆ مەحــــاڵە ژینم
خەندەو خۆشیم هاوارە
تروسکەی نییە ژینم

××××

وەرە دەستی یەک بگرین
بۆ خۆشبەخت ڕێ بگرین
لەناو خەندەی جێژوانا
دنیا پڕکەین لە ئەوین

××××

ئاوێنەی دڵی یەک بین
پەنجەرەیەک بین بۆ ژین
هەتا دوا ڕۆژی تەمەن
هەرگیز لەیەک دوور نەبین

# سایە

بەسۆزەوە گوڵم ناسی، وەکو یەکەم نمەی باران
بەپرچی خۆر ئاشنا بووم، تا ئاوابوونی ئێواران
خەندەو قاقای پێکەنینم، ئاوێتە بوون بەئەشکی گەش
دوا ئەستێرەی پرشەدارم بوو بەخاڵی شەوێکی ڕەش
دڵم سپارد بە دڵێکی ناو ئاوێنەی چەم و کانی
عومرم بوو بە چڵەدارێ و گەڵایەکی بۆ نەهانی
هەرچەن ئەکەم یادگارێکی منالٚی خۆم پەیدا نابێ
چاوەڕوانی هەتاوم کرد، کەچی شەوی بەسەر دادێ
وەک چۆن شەپۆل هاژە ئەدا لەدەریاوە بەرەو کەنار
چەن هەنگاوی بێ باک دەنێم ناگەم بە مۆمێکی بێدار
وەکو پاییز لە ناو پرسەی گەڵاکانا دائەنیشم
لەدوا بادەی ئەشکی هەوران بادەی تەنیایی ئەنۆشم

## دڵدانەوە

قەت دڵت مەدە بەچڵە نێرگزێ
نەبا عومری تۆش وەک عومری ئەوبێ
وەکو پەپوولە دیداری گوڵ کە
بەشوێن شەماڵا هەنگاوت بنێ

دڵت مەست مەکە بەپەڵە هەورێ
نەبا چاوانت داکاتە باران
لەمەغریبەوە جوانـی شەو دیارە
هاوڕێی شەوانە، ئەستێرەی ئاسمان

لەناو گوڵدانا عەشقی گوڵ مەبە
چونکە دوارۆژی ژیانی ئەوە
ناتوانی تازە بیگێڕیتەوە
چونەوەی بۆ باخ ، خەیاڵ و خەوە

## بەفر

که منداڵ بووم
به بارینی بەفری تازه دڵخۆش ئەبووم..!!
حەزم دەکرد .. له ناو بەفرا
بەشوێن پێی هیچ کەسێکی تردا هەنگاو نەنێم
دەکەوتمه سەر تەختی بەفر و
ڕێگایەکی تازەم دەبڕی ..
شاگەشکه بووم به بڕینی ڕێگای تازه لەو بەفرەدا
حەزم دەکرد شوێن پێکانم لەو بەفرەدا قەت ون نەبێ
کەچی ئێستا گەورەبووم و
وەک ئەو کاتەی خۆر هەڵدەهات
نەشوێن پێی خۆم ، نەشوێن پێی کەس ، بەدی ناکەم
چاودەگێڕم بۆ ڕێگایەک
نەبا خۆشم له ژین ون کەم !!

# شەقامی یاد

ئەڕۆم بەسەر شەقامێکا ، پڕ لە یادی منداڵیمە
کوچەو کۆڵان پێ نازانن ، کە جێگای شاری یاریمە
دارتێلەکان نامناسنەوە ، کە ڕووناکیم لێ ئەشکاندن
بۆنی بوغوردێ نەماوە ، شەوی جەژنان ئەمسووتاندن
ئەڕۆم بەرەو ئەو ڕێگایەی ، کە ڕۆژانێک شاری من بوو
چەن زەنگیانەو مووروی وردم ، لە ناو دڵیا زۆر لێ ون بوو
پەشیمانم لەو ڕۆژانەی ، بەردم ئەگرتە دارەکان
کەچی ئەوان تووی شیرینیان ، بۆ بچووکی من ئەوەران
ئەو سەردەمە بەهار گوڵی بەچەپکەوە لەسەر ئەدام
ئەو ڕەنگانەی ئێستا ماتن ، نیشانە بوون لەسەر ڕێگام
بەیانیان زۆر بە ئاوازی چۆلەکەکان خەبەر هاتم
بەلام ئێستا ئەڵێی خەونە گشت ڕابردو و بەسەرهاتم

# ڕەنگی باران

سەردەمێک بوو خۆشەویستیم ، لەناو تیشکی هەتاو ئەچنی
گەڵای خۆزگەم لە ناو باخی ، عەشقی پاکی تۆدا ئەڕنی
شەوقی چاوت وەکو تاڤگە ، ئەڕژایە ناو چاوانمەوە
بەهار ئاسا بەڕەگی گوڵ ، هاتیتە ناو ژیانمەوە
وەکو بەفر کە دوا چڵی درەختێکی سپی ئەکرد
یا وەک سروە کە دوا خۆزگەی بۆ هەورێکی ئاسمان ئەبرد
تۆ هاتیت و دەنگی نەرمی بارانێکی بێ چرپە بووی
دڵی ماتی ڕێبوارێکی پڕ ئەوینی بێ ترپە بووی
شاخە بەفری ناو دەریا بووی ، لەناخمدا تووایتەوە
چرۆیەکی نەوبەهار بووی ، لەسەر چڵم ڕووایتەوە
لەشەپۆلی هەورا ئێستا کەشتی مانگم لێ ون بووە
لە ناو دڵێکی بەردینا ، دڵی خۆشم لە دەست چووە

# پێنووس

تەماشامکرد پێنوسەکەم بۆ تەنیایی خۆی دەگریا
هێندە گریا بەفرمێسکی ، لاپەڕەکەش بوو بەدەریا
دەریایەکی سپی و بێگەرد هێڵەکانیش بوونە شەپۆل
پێنوسەکەم هەر دەسوتاو لاپەڕەکەم وەکو سەهۆڵ
ئەوسا زانیم بێ ئاگا بووم ، تا ئێستاکە چیم نووسیوە
چونکە خاڵی هەموو حەرفێک ، ئەشکێک بووەو نەمبینیوە
منیش زۆر جار دڵی تەنگم ئەڵێی هەوری بێ بارانە
بەڵام کەسێک نەیزانیوە ناخم دەریای پڕ گریانە
من هەر سەودای گوڵم ئەکرد کەچی دڕکێک دەستی گرتم
ویستم بۆنی هەڵاڵەکەم بارەش هات و زوو لێی بردم
شەوم سپارد بەتەنیایی و ڕۆژم بەخشی بەئێوارە
کەس گوڵێکی بۆ نەناردم لە گوڵزاری ئەم بەهارە

# پەری خەیاڵ

خۆشم ئەوێ‌ی وەک ئەو بایەی دەست لەپرچی تۆ بەرنادا
خۆشم ئەوێ‌ی تا ئەو ڕۆژەی ناوم ئەمرێت لە دنیادا
لەسەر ڕێگەت ئەبم بەباخ ، تەنیا لەبەر خۆشەویستیت
ڕۆحم ئەدەم بەخەندەیەک ، بۆ ڕۆژانی خەم و پەستیت
گەرچی گوڵم تۆ بێئاگای بۆ ساتێکیش نەتناسیوم
بەڵام چیبکەم کە ئەتبینم ، ئەڵێ‌ی مەستی ڕەنگ پەڕیوم
چەخماخەی پڕ تەماشای تۆ ، هەناسەیەک نەیداوە لێم
دیارە لای تۆ پێناسەی من ڕێبوارێکەو نازانی کێم
تاوێک پەری خەیاڵمبە ، باهەڵبەستێک داگیرسێنم
با لە شەوی شیعرەکانما لە جێ‌ی چرا تۆ بدوێنم
بێئاگا نیم خۆ ئەزانم تەنیا هەر خۆم فریو ئەدەم
بەڵام من بە تیشکی چاوت هەزار شیعر ڕۆشن ئەکەم

# چوار باخ

ئەی هەناسەو دڵ و هەستم دایکی شیرین نیشتمانم
لەم غوربەتە بەیادی تۆم بەعەشقی تۆ ئاوێزانم
هەرچەند دووربم تۆ هەمیشە لەخوێنمدا دێیت و دەچی
نەوبەهاری ناو تەمەنمی کزەی ڕۆحم بەتۆ دەژی
بۆیە وێڵی ئەم چوارباخەم ، گوڵاڵەی سوور دایپۆشیوە
ئێشکگری چوار ئەستێرەم ، ئاسمانی خۆیان نەدیوە
ڕۆحم زادەی ئاوو خاک و سیمای ڕونی ئاگرێکە
چوار ڕەنگەکەی ئاڵای بەرزم پەیامی نەوبەهارێکە
وەکو مناڵ ڕێ دەژمێرم ، چەن لە دایکم دورکەومەوە
هێندە زیاتر بەتاسەوە ئاوڕی بۆ ئەدەمەوە
هەرچەن باڵای تەنیایی من غوربەتێکی سەرەڕۆیە
تۆ لە دڵمای دایکی شیرین دەنگی دڵم هەر لای تۆیە

## شەرم

لەو ساتانەی لێو ئاڵ ئەبێ و کوڵمت گوڵی لێ ئەبارێ
چاوم بۆیە لێت ناترووکێ تا وشەی دڵ بێنمە زارێ
لەدوورەوە چاوم تیشکێک لە ڕوخساری ئاڵت ئەگرێ
دواهەناسەو دڵ پێی خۆشە لەسەر لێوت ڕێت پێ بگرێ
هەناسەکان کاروانێکن یەک بەدوای یەک سەودای ماچن
وەک چەپکە گوڵی دەم زریان وا ژاکاون لە گوڵ ناچن
ناچار پەنجەی شەرماوی خۆم بۆ دەستی تۆ ئەجوڵێنم
پەتی بەندی ئەم حەسرەتە بەم هەنگاوە ئەپچڕێنم
لەکاتێکا پەنجەی لەرزۆک لە دەستی خونچە گیر دەبێ
خوێنیش لە ناو خوێنبەرەکان پەیامی ناز لە دڵ ئەنێ
ئەو کاتە دڵ دێتە خورپەو هانای حەزێک بۆ تۆ دێنێ
شەرم ئەشکێ و ناوی ماچیش بەگوێچکەتا ئەچرپێنێ

## دیاری خەم

دیسان ئەمشەو لە چاوانما خەمێکی تر بوو بە دەریا
دڵیش وەکو بەلەمێکی بێ چارۆکە لە ئامێزیا
خەمم نۆشی و خەمم ناسی ، لەگەڵ خەما تووامەوە
لەگەڵ ئەودا چرۆم گرت و بۆ دووبارە ڕووامەوە
خەمم کردە دەروونمەوە و دواهەناسەی پێ نەبەخشیم
قوربانی بووم لە ڕێگەیا کاسەی مەرگی پێ نەنۆشیم
چاوەکانم ئەشکیان ئەگرت دەڕژانە ناو دەریای خەمم
بینایمی داپۆشی بوو وامئەزانی هەور و تەمم
خەمێک هێندە بێ وەفا بێ کەسێک دڵی بۆ بکاتەوە
ئەو بۆ جارێک وەکو دیاری مەرگێکی بۆ نەباتەوە

# ڕەنگ

بەهار گوڵێکی نەدا لە سنگم
خەندە نەڕژایە ناو دڵی تەنگم
پاییز خەمێکی لێ نەوەرانم
هەورێکی ڕەش بوو ڕەنگی ئاسمانم
چاوم بەم ئەشکە بوو بە نابینا
عەشق خۆی نەکرد بەماڵی ژینا
ڕووناکی هەتاو نەگەیشتە دڵم
ڕەنگێکم نەدی لە ڕەنگی گوڵم
وەرزی ژیانم هەمووی پاییز بوو
تەمەنم وەک خەو گشتی لەدەست چوو

# ئارمان

چۆن ئەتوانی شووشەی عومری گوڵی باخچەی دڵ بشکێنی
لە چاوانی تۆدا ون بووم ، مەگەر هەر خۆت من بدوێنی
وەک چۆن شەوێ کەمانگ نەبێ ، جێگەی لەدڵی ئاسمان دیارە
بڕوابکە ڕۆژەکانیش ، بێ تۆ لای من شەوی تارە
دوا دەروازەی بەختی منی ، ئاخۆ کەی بێ و بکرێیتەوە
هەتاوێکی ئێوارانی ، جارێکی تر هەڵدێیتەوە
خۆرەتاوی ئەمڕۆ و سبەی ، تۆ لەبەفر سپی تری
بەڵام وەکو دەریای بەستوو ، بۆ شەپۆلم ساردو سڕی
خۆتۆ گوڵی پاییزە نیت ، دەست لە چڵم بکەیتەوە
دەریاوانی بێ چارۆکەی بۆ کەنارم هەر دێیتەوە
لەناو هێڵی دەستی منا ، ڕێی بەیانی خۆت ئەبینی
دڵنیابە ئەبێ گوڵی خۆزگەی من و خۆت بچێنی

# بارەش

ئای لە بارەشی خەمبار ، دیسان گەڵای هەڵوەران
پاییزی گرتە باوەش ، سەراپا باخ و بێستان
فرمێسکی هەوری ئاسمان ، دڵدانەوەی گوڵان بوو
لەگەڵ وەرینی گەڵا ، تەمەنی دار بەسەر چوو
هەرگیز ناگەڕێنەوە ، ڕۆژەکانی بەهاری
سێبەری مەستی داران ، گشتی بوونە یادگاری
بە گڕی هەور و ڕەشەبا ، پاییز درەختی سووتان
بوو بەفەرشی سەر ڕێگا ، گەڵای زەردی بن داران
کاتێ گێژاوی بارەش بۆ گەڵا هەڵی ئەکرد
تیشکی هەورە بروسکە ، وێنەی سروشتی ئەگرت
دیمەنێکی خەمبار بوو ، ڕۆژی کۆچی ڕەنگەکان
ئاسمان ببووە دەریایەک ، هەورەکانی ئەگریان

# موسافیر

موسافیرێکی دورەوڵاتم
خۆزگە دەخوازم بە کۆتری ئازاد
چەندە سنوری ئاڵۆزاو دەبڕێ
تا بەدارێکی کوردستان دەگات

دڵی خۆم ئەدەم بەو پەڵە هەورەی
کە لای من دەڕواو لەوێ دەبارێ
بۆ جەژنی نەورۆز دەگەڕێتەوە
دەبێتە میوان وەرزی بەهارێ

بریا خەیاڵم ئەبوو بەڕاستی
تا ئێوارەیەک لەگەڵ خۆی بمبا
یا ئەستێرەیەک بانگی ئەکردم
ئەوسا لە دەگای دڵی تۆم ئەدا

# باران

چەن شیرینە ئەو بارانەی ، کە دائەکا لەناوەختا
چەن ڕەنگینە ئەو بەهارەی ، گوڵ دائەنێ لەناو بەختا
دەریا لەبەر کەنار نەبێ ، هەرگیز هێندە شەپۆل نادا
بەفر لەتاو ئاگر نەبێ ، بەسەر خۆڵا قەت داناکا
داری لاولاو بۆ بەرزی خۆی تەختی دیوار ئەکا بەگوڵ
تەنیا سۆزێک ئەبێ چی بێ ، سەرمایەیە بۆ ماڵی دڵ
ڕووبار لەبەر تەوژمی خۆی ، دەشتێک ئەکا بەو خەرەندە
خونچە لەڕێی پەپوولەیا ، ئەشنێتەوە پڕ بەخەندە
جوانی دەرگا لەوەدایە کە هەمیشە لەسەر پشت بێ
کێ دەزانێ دڵی شکاو ، ئەبێ دایمە لەسەر مشت بێ
کە شەو نەبێ هەڵهاتنی ، تیشکی هەتاو بێ بەهایە
دەنگانەوەی دوو شاخ نەبێ ، کێ دەنگی خۆی لەگەڵدایە

# چ دەریایەک؟

چ دەریایەک هێندەی چاوم ، شەپۆلی دا تا بتبینێ
کام وەرزەت دی وەکو من بێ ، تا لەڕێتا گوڵ بچێنێ
ئەگەر گوڵ بی لە (با) زیاتر ، ئەهاتمە لات تابتبینم
ئێستاش وەکو هەتاوی گەش بەتۆ ڕوونە ڕێگەی ژینم
وەکو پەڵە هەوری بەهار ، کە چۆن ئەدا بەسەر شاخا
وێنەی ژینم تەماوی بوو ، بەم عەشقەی تۆ وا لە ناخا
ئەی بارانی هات و نەهات ، کەی دەبارێی بەسەر باخم
تا سەراپا چرۆ بگرێ چڵی هەست و داری ناخم
ڕۆژەکانم پڕکە لە خۆر ، با بەجارێ دور لە شەو بم
نەوەک ئێستا کە ئالودەی پڕ خەیاڵ و مەستی خەو بم
ئاوازێک بە بۆ گۆرانی و دەنگی ماتی نیگەرانم
ناونیشانبە بۆ دوا پەڕەو دواهەڵبەستی ناو دیوانم

له ئاوێنەی ئەم شیعرانەوە ..
مشتێک خۆشەویستی ڕوونی وشەت بۆ ئەنێرم
له باوەشی ئەم نیشتمانه بێ کەس و کارەوە
قەڵەمی ماندووم بەعەشقەوە ئەخلاڤێنم
له باخی وشکەڵاتووی زەردەخەنەدا
هێشوو هێشوو .. ئەنگوری وشەت بۆ ئەنێرم
لەدەمەو ئێوارانی شارەجوانەکەی تۆدا
چاوم تینووی سەرنجێکه ..!
تەماشام ماندووی ڕێگایەکه ..!
گوڵەخان .. تۆش ئەگەر ویستت سیمام ببینی
برۆ تەماشای ڕوخساری پاییزکه
ئەگەر ویستت بەهار ببینی
وەرە لەبەر ئاوێنەی ئەم شیعرانەدا
تەماشای ڕووی لالەزاری خۆت که
ئەم شیعرانه .. گۆرانین
ئەم گۆرانییانه .. شیعرن
بۆ لای تۆ دێن و له تەنیایی تەنیاترن
ئەم لاپەڕانەی رەش بوونەتەوە
فرمێسکی تەڕی پێنووسەکەمه

رژاوه بەسەر هەموو دێڕێکیا
کزەی دەروونم هەڵی کردووەو
پشکۆی هەناومی گەشاندۆتەوە
لەگەڵ سووتانی هەناسەی ساردو تەزیوی خەما
دەنگی دڵم بوو ئا بەم حەرفانە ..
من خەمی قوڵی بێ هاناو پەستم
تەنیا هەر بۆ خۆم ئەنووسمەوە
کەچی زۆر سەیرە .. کەسێکی تر دێ
بەسۆز و بەستەو ئاواز و دەنگی
حەرف و هاواری منی بێ هانا
بەسۆز و گۆرانی بۆ تۆ ئەڵێتەوە
تۆ بڵێی خەمی من ئازاری ئەو بێ؟
یاخود بمناسی و پشکۆی ئازارم گەیی بێ بە ئەو
نا .. نا دڵنیام ئەم هەڵبەستانە ،کانی و ئاوێنەی دەرونی رونمن
هەرکەس خەمی خۆی تیا بەدی ئەکا
دیارە لەکاتی بەستەو ئاوازیا
نەک هەر خەمی من ، بگرە ناویشم بێ شک ون ئەکا.!

هەمیشە خۆزگەکانمان
ئاو ئەدەین ، تا سەوز بن
بەڵام خۆزگەکان وەکو
گەڵای درەختەکان نین
تا لە بەهارێکا سەوز بن و
لە پاییزێکا هەڵوەرێن.!
خۆزگەکان هیچ وەرزێکی تایبەتییان نییە ..
نەبۆ سەوز بون ،
نەبۆ هەڵوەرین !
خۆزگەکان لەکاتێکی نادیارا دەرئەکەون
بەڵام کەمجار سەوز ئەبن ..
زۆرتر ئەوەرێن.!

# شەوانە

شەوان لەگەڵ ئەستێرەدا ، سیمات دێتە چاوانمەوە
ڕۆژان تیشکی نیگاکانت ، دەرژێنە ناو هەتاومەوە
هەر ڕووناکی یادەکانتە چرای منن بۆ هەمیشە
پڕ سێبەری درەختێکن ، لە دڵمایە ڕەگ و ڕیشە
ئەی ئارامی گیانی ماندووم ، تۆ لەیادما بێ پایانی
ڕۆژگارێکی بەختەوەریت ، وەرزی تازەی ناو ساڵانی
ڕێگایەکی پڕ وەنەوشەی ، دڵت تاڤگەی کانی و ئاوە
رەگی داری ئەوینی تۆ ، لە ناو دڵی من ڕوواوە
بەسەر باڵای تەنیایما وەکو باران داباریویت
بەڵام چیبکەم بارەشی خەم ، لە چاوانمی دابڕیویت
ئەی چیرۆکی درێژترین ، خۆشەویستی بێ کۆتایی
لەگەڵ تۆدا ڕێگا ئەکەم هەتا خاکی دڵنەوایی

# ڕۆژگاری دڵشکاو

ئەی ئەوی خەونەی بەجێت هێشتم، تا هەمیشە نایەیتە دی
چۆن ئەستێرەی شەوانت بم، کە تۆ خۆر و مانگم نەبی
چۆن بتوانم لە ناو هەورا، تیشکی هەتاو بناسمەوە
وەکو شەپۆلی بێ ئارام ، کەناری خۆم بدۆزمەوە
دەمن چیبکەم نامورادی دەست، لە خۆزگەی من هەڵناگرێ
هەتا شووشەی دڵم نەشکێ ، وردە ماسی ڕۆحم نامرێ
ئەی ئەو دڵەی لە سینەما ئێستاش وەکو جاران ماوی
بۆ نازانی لە گریان و پێکەنینم بەجێ ماوی
من و تۆ وەک دوو گەڵا بوین، پاییز زووتر منی وەران
تۆ ڕۆژگاری دڵشکاو بوی، شەوی چاوت منی تۆران
باوەڕمەکە لەشەوی خەم، چرای خنکاو هەڵکەمەوە
خۆ من خەونی منالێک نیم ، دڵم بە تۆ ژیرکەمەوە

# گوڵە شیعر

تۆ بە گریان منت ناسی، چۆن بە خەندە بەجێم دێڵی؟
بێگومـانم کە ناتوانی، من لـە دڵی خۆت دەربێنی!
خۆت نابینی لە چاوانما، گوێت لە ترپەی دڵم نییە؟
لە دارێکی ڕوتەڵ ئەچم، کە سێبەری بۆ خۆی نییە!
خۆمن پێکێکی بەتاڵ نیم، بۆ ئەتەوێ بمشکێنی
بۆ ئەتەوێ وەکـــو دڕک، لە دەستی خۆت دەرمبێنی
پـــاییزیـش بم دڵنیابە، هـــەزار گوڵی شیعر ئەگرم
باڵدارێکی شکستەش بم، بەچاوی تۆ من باڵ دەگرم
بێ مروەت بوی نەتووت ئەمە، ڕێبوارێکی نیشتیمانە
لـــە ئێوارەی غەریبیدا، بـــە چـــاوانـــی تۆ میوانە
ئاسودە بووم کاتێ گەشتم، بە پیرۆزی بەهاری تۆ
گەرچی هێشتا پێ نازانی، سەرگەردانم یا سەرەڕۆ

# پەیکەری بەفر

هاتووم ئەمشەو وەکو بـاران، لە نـاو چاوتا داکەمەوە
گریانێک بم وەکو ئاسمان، بەهیچ کەسێک ژیرنەبمەوە
هاتووم لەگەڵ تەنیایدا، تۆ بە شیعرێک ئاشت کەمەوە
لە ناو دڵی مەستی تۆدا، چرای خۆزگەم هەڵکەمەوە
وەکو نامە بە بێدەنگی، دەست ئەخەمە ناو دەستەوە
بـە تەنیایی بۆ تۆ ئەدوێم، تـا بڕژێمە ناو هەستەوە
من پەیکەری ئەو بەفرە نیم، کە بە هەتاو بتوێتەوە
ڕۆژانێکی نـاو عومری تۆم، تـا هەمیشە ناسڕێتەوە
من لەو ساتە شیرینتربووم، کە دوا ساتی سەری ساڵ بوو
لەو نێرگزە ڕاستگۆتر بووم، کەپەرچەمی دەشت و یاڵ بوو
ئاخ لە دڵەی بێویژدانت داخ لـە تیشکی چاوەکانت
کە نەتبینی خۆری عەشقم سەری هەڵدا لە ئاسمانت

# تابلۆ

تۆ بوی منت کردە خۆری، نــاو ئاسمـانی تابلۆکانت
لەناو تەمی خەیاڵی تۆ بووم، بە خونچەی ڕێی ژوانت
بەنیگاری خۆشەویستیت، ڕەنگەکانت پێ ناسانم
بۆیــە ئێستــا لە ئـاسمانتا، هــەتاوێکی بــەیـانیـانم
من کە نمەی بارانێک بووم، لە چاوانتا بووم بە دەریا
هــاتیتە نــاو دڵی تـارم و خۆرەتـاوت کرد بــە بــەریــا
لە ناو باخی وێنەکانتا، ڕۆژێک گوڵ بووم، ڕۆژێک باران
وەرە ساتێک با لەباڵ دەین بۆ خۆشبەختی بەرزی ژیان
تۆ خــەونێکی لە چاوانما، بە تۆ ڕوونە ژووری تارم
تۆ ڕەنگاڵەی باخی دڵمی، تۆی شنەبای نەوبەهارم
لــە خــەندەدا چـاوم بۆ تۆ، لــە گریـانـا دوا هەناسەم
خۆشەویستیت بێ سنورە، هەر بۆ تۆیە مەیل و تاسەم

# گۆچان

تووئەو چەترەی کە هاوڕێتە ڕۆژی تەم و باران و تاو
دەستت ئەگرێ و جێت ناهێڵێ تا ئەتداتە دەستی هەتاو
تووئەو ڕێیەی یەکەم هەنگاو دەست پێدەکات تا دڵی من
خۆزگەو ئاهم لێ ون نەکەیت، بیخەیتە ناو دەریای بێ بن
وشکەداری چەماوە بووم ، بۆ دەستی تۆ بووم بە گۆچان
تا لەگەڵتا ڕێگا بکەم ، بەدوورت کەم لە داچەمان
تازە گوڵی چیم بۆ دێنی، کە من دڵم هەڵوەریوە
لە هەواری خۆشەویستیت ، هیچ ئارامیم تیا نەدیوە
عەشق وەکو دەریا وایە، چەن شەپۆل بەی لەجێی خۆتی
لە باڵندەی قەفەس ئەچێ ، چەن هاوارکەی دیل و کۆتی
دڵم ئێستا وەکو ماسی، لە تۆڕی تۆ نابێتەوە
چاوم وەک مۆم تا دواتەمەن، بەسووتان بۆت ئەتوێتەوە
زۆر ئەترسم ئیتر ناوم نەبیستمەوە بە دەنگی تۆ
وا بەجارێک کاڵ ببمەوە ، هەرگیز نەگەم بە ڕەنگی تۆ
بەڵام من هەر دیلی تۆم و قەت ئازادیم ناوێتەوە
دڵم ڕەگی لای تۆ دانا، هەڵیکەنی ناڕوێتەوە

هەتـا چاوم لـە کـارا بوو ، ڕەنگێک نەهاتە سەر چاوم
هەتا دڵم وەک شووشە بوو، شکانیان هەست و هەناوم
تازە گوڵم من نـاتوانم، لەگـەڵ خۆمـا ئاشت ببمەوە
وەکو بەفری چلەی زستان ، بەسەر خۆما بتوێمەوە
دڵم وەکو هەرمێی تەزیو، خەم بەسەریا داباریوە
باڵدارێکی ڕێی بارانە لە ئاسمانی خۆی تەریوە
گەڵایەکی خۆرنەدیوم پـاییز وشکم ئەکـاتەوە
وا ڕەشەبا بەیەکجاری، دەستم لە چڵ ئەکاتەوە
ڕێی شیرین و تاڵیم بڕی، کـەچی هێشتا سەرەتایە
خەون و ڕاستیم لێ ون بووە، خۆزگەش بەناو دڵما نایە
وەکو هەورێ دێت و دەڕوا تاوەڕێژنەی بیرچۆتەوە
چاوی مـاندووم بۆ بـارانی فرمێسکی خـۆم کردۆتەوە

# تاریکی

ئەی رۆژگاری پڕ حەسرەتم ، گەر بێدار نیم هەڵمسێنە
وەک درەختی دەم رەشەبا ، تا ئەتوانی راموەشێنە
تا ئەتوانی گۆشم بکە ، من دڵی خۆم ونکردووە
لە ناو چاوی بێداریما ، تاریکیم لێ هەڵکردووە
لەگەڵ خەون و ئەفسانەدا ، ئاوێتە بوم بەیەکجاری
ئەو تەمەنەی دەستی گرتم ، لە دەستیدام نەوبەهاری
ئاسودەیم لێ ون مەکە ، وەک بارانی وشکەساڵی
ئەشکی چاوم شەپۆلی دا ، لمی دەریای رانەماڵی
ئەی رۆژگارم بانگم بکە ، من دەنگی خۆشم نابیستم
وەک چۆن گەڵا زوقوم لێیدا ، لەبەر چاوام بەڵام سستم
لەم خەونەدا هەڵمسێنەو با بێمەوە ناو دڵی خۆم
بە شوێن خاکی خەیاڵێکا ، بە بێئاگا ئیتر نەڕۆم

ئەحمەد محەمەد

# نامە

نامەیەکت بۆ نوسیوم ، تا ئێستا چەن گوڵت دیوە؟
هەتا ئێستا چەن گەڵای دار ، لەبەر پێتا هەڵوەریوە؟
چەن هێلانەت لە کۆڵناوە ، کە رەشەبا وێرانی کرد؟
چەن شەپۆلی شێتت بینی ، لە دەریاوە سەریانهەڵگرت؟
بۆت نوسیوم چرپەو نیگات بۆم بنوسەو بۆم بنێرە
خەمت دەکرێ بە گۆرانی هەتا بەمن دەگا لێرە
منیش هاتم بۆ تۆم نوسی ، هەناسەکەم زوو دێمەوە
نەبا وەکو بەفری بەهار لە ناو ئەشکا بتوێمەوە

# هەتاوی پاییز

هەتاوێکی ئێوارە بووی، لە ئاوابوون شیرینتری
فریامکەوە ناخم بەستی، لە غەریبی و ساردو سری
من پایز بووم تۆ بەهاربووی، بەناکامی تۆشم وەران
هەنارێکی بەرهەتاو بووی، نەمزانی زوو دڵتم شکان
وەکو هەتاو ڕژایتە ناو، هەست و ناخ و دڵی تارم
لەبەردەرگای چاوەکانتا، نامەیەکی لێو بەبارم
کەنەتوانم هەناسەت بم، لە ڕۆژانی تەم و تۆفا
خەندە نەبم بۆ ناخی تۆ، لە ئازار و ئاخۆ ئۆفا
کە نەتوانم شنەی تۆ بم، گەڵای پرچت ڕاوەشێنم
ئیتر بۆچی وەکو دەریا، بەرەو لای تۆ شەپۆل بێنم
لێم ببوورە پاییزی بووم، بە دڵتەنگی بمناسەوە
نەکەی گوڵم یادەکانم، بخەیتە ناو تاسەتەوە
وتم نەبا ڕەنگی ئەوین، لە چاوانی تۆش بتۆرێ
نەبا دڵی بەهاری تۆ، بەخەزانی من هەڵوەرێ

## دوا سات

ئەی خۆرەتاو هەر بۆ ساتێک، لەبەرزیتا وەرە خوارێ
تــا بزانی چەند بەژانە، ئــاوابــوونــی لای ئێوارێ
تا ببینی چۆن گەلاکــان، دەست لـە دەستی یەک بەرنادەن
چۆن باوبۆران بەتەزیویش، دوا سات بێ ماچ قەت هەڵناکەن
دڵنیابە من بەفرێکم ، لە نــاو پێکتــا تووامەوە
رێگایەکی داخراو بووم، لەسەر رێی تۆ کرامەوە
من دڵۆپێک ئەشکی تەڕبوم ، کەوتمە دەریای چاوانتەوە
باڵدارێکی بێ لانە بووم ، بــاڵمدا بە ئــــاسمانتەوە
وەک دواگەڵای چڵی شاتوو ، بەشەمــاڵت هــاتمە سەمــا
گەر بۆ ساتێک دەستم بەردەی ئەمرم لەناو ئەشک و خەما
ئاسوودەم تا گیان بسپێرم ، هەر ئەوەندەی زوو بگەم پێت
بە وەرینیش بۆ لای تۆ دێم ، بــەمردنیش دێمە سەر ڕێت

# هەڵبەست

کێ وەکو من لەتاریکیت، خۆری کرد بە کانی چاوت؟
کێ وەکـــو من دیوانێکی پڕگـۆانی کرد بەنـــاوت؟
لە دوورەوە کێ تۆی بردە بەر ئاوێنەی روونی کانی؟
لە گریـان و پێکەنینـا ، وەرزی دڵی تۆی ئەزانی!
لە دڵتەنگی بـــارانت بووم ، لــە خۆشیدا هـەر گۆرانی
وەکو گەڵا زوو هەڵوەریم ، کەوتمە سەر رێت بەئاسانی
یەکەم حەرفی ناوەکەی تۆ، بوو بەشیرینی زمانم
بەڵام گوڵێ دڵنیـابە ، من بـەبێ تۆ سەرگەردانم
تازە لەناو شەوو رۆژتا ، یادگاری من داگیرساوە
ناونیشانم هـەڵبەستێکە ، لەنـاو دڵتـا بەجێماوە
چۆن ئەتوانی رەزی شیعر و بـــاخی وشەم فەرامۆشکەی
بێ ئاواز و گۆرانی من ، بەعەشقی تر دوا پێک نۆشکەی

# سەرمەست

بڕوا بێنە بەو قەدەرەی، کە من و تۆی بەیەک ناسان
بەو ئەوینەی بە هێمنی، هاتە دڵت زۆر بە ئاسان
بڕوا بێنە بە هاتنەوەو گەڕانەوەی بەفری ئەمساڵ
بەو هەڵبەستەی بە شێتانە، چاوەڕێتە وەکو مناڵ
بەو نامەیەی کە باڵدەگرێ، تا دەگاتە دوورە وڵات
وەک چیرۆکی ئەفسانەیی، تا بەدەستی خەیاڵ دەگات
نەکەی بڕۆی بەجێم بێڵی، دوا ئاوازم بکەی بەشین
من سەرمەستم بە ناوی تۆ، لێم مەبەستە دەرگای ئەوین
یادت ماوە تۆ خۆت وتت، من بە خۆرت دەکرێمەوە
وەکو بەفر لە ناو گڕی، تەنیایتا ئەتوێمەوە
چۆن فرمێسکێک کە ئەوەرێ، ناچێتەوە ناو چاوانت
یا وەک ڕۆژێک تێئەپەرێ، نایەتەوە سەر ژیانت

# تەزیوو

تۆ لە دڵمای بەڵام چیبکەم، کە من هێشتا لە خۆم دوورم
لەوەتەی هـەم دڵشکاوم ، لەنـاو عومری سەوز و سوورم
توو ئەو خۆرەی لە چاوتایە، توو ئەو هەستەی لە ناختایە
لـە ئێستـاوە تـا هـەمیشـە ، دەرگـای دڵـم ئـاوالآیـە
منیش ئاوا لەسەر رێتـا، بـاڵداریکی هـەڵکورماوم
بەڵام چیبکەم بۆ لەباڵدان، کۆترێکی باڵبەستراوم
توو بەهارێک کە چاوەڕێی، لەسەر ئەسپی خەیاڵم بیت
کە هـاتییەوە ئـارامکـە، تەنیـا چـرای نـاو ماڵم بیت
لەبەهارا رەنگم دانا ، لەگەڵ بەفرا دڵم تەزی
بەنیگای خۆر تووامەوە ، لە پاییزا چاوم وەری
رووبار هـات و بەجێی هێشتم، ئـاوڕی لێم نەدایەوە
خۆر بەخەندە لەمن هەڵهات ، شەوی هێنا بەدوایەوە

# بارین

دڵم هێنده بەتەنهایە، وەک ئەستێرەی لە شەو جێماو
ئەڵێی بەفری دوای بـــارانە، وا خــەریکە ببێت بە ئاو
نەمدەزانی هاوڕێی دڵم، گرێی خۆزگەم ناکاتەوە
بەهارێکی وشکە ساڵە و ئـاورِ لـە گوڵ ناداتەوە
رۆژانێک بوو دوو گەڵا بووین، شەماڵ دەستی ئێمەی ئەگرت
دوو هەور بووین لەنـاو یەکا، هـەتاو ناخـی ئێمەی تەی کرد
کەچی تۆ وەک بەفری بەرخۆر، لەسەر لوتکەم توایتەوە
دەرگـایەکی داخــراو بوویت، بـۆ پێشوازیم نەکـرایتەوە
کـێ ئێوارەی هێندە روونە، کـەخـۆر تیـایـا هەڵبێتەوە
کێ رێگایەک ئەگرێتە بەر، کە سەد رێگەی لێ بێتەوە
هەورێک نەبووی لە ئاسمانا، بەهیچ بایەک دانەنەوی
ئەشک نەبوی تـاهـەمیشە لە چـاوانی من دەرکەوی

## غوبار

هەراسان بووم، چونکە عەشق، سەرابێکی پڕ غوبارە
وەک ڕەشەبای سلێمانی، گوڵ شکستەی ناو بەهارە
ئیتر بە گوڵ فریو ناخۆم، بۆنی دیارە بێ وەفایە
ساتێک لەگەڵ پەپوولەداو ساتێک لەگەڵ شەماڵدایە
تۆ نەتدیوە کە پەپوولە بە عەشقەوە بۆ مۆم ئەچێ
بەڵام ئەو زۆر بێ باکانە ، ئاگر بەسەر دڵیا ئەنێ
تۆ بڕوانە هەنگەزەردە ، کە بەسەر گوڵ ئەخولێتەوە
شەماڵ دەستی چڵی ئەگرێ و گوڵ لە ماچ دوور ئەخرێتەوە
من لە دەرگای گۆرانیمدا، فرمێسکم لێ کرایەوە
لەو شوێنەی گوڵی تیا وەری ، دڕکێکی لێ ڕووایەوە
باسی خونچەو چرۆ مەکە، من بەهارم لە دەست داوە
زەردەخەنەم کەوتە ژێر لێو ، چرایەکی کز کراوە
عەشق بەفری پێش بارینە، کە گەشتە خاک ئەتوێتەوە
چاوی کز و دڵی پڕە ، هەر بە گریان ئەکرێتەوە

# شنەبای هەست

چرای خامۆشی لێڵ و بێڕەنگم
ئەستێرەی دووری ناو شەوەزەنگم
رێگەی نەهاتی هەزار دوڕیانم
شەپۆلی توڕەی دەریای ژیانم
چاوم بەهار و رێژنەی بارانە
وەرزی رەنگینم گەڵارێزانە
دڵی غەمگین و شنەبای هەستم
ئاوێتەی ئەشکە روخساری مەستم
دواین دەواری پیرە جوتیارم
لەناو پاییزا وێڵی بەهارم

# ناسین

که تۆم بینی خۆر ئاوا بوو ، ئەستێرەکـان کەوتنە سەما
لە ناو وەرزی تەنیاییدا ، شوێن هەنگاوێک بۆ من نەما
تیشکی نیگات، خەندەی بەخشی، بەئاسمانی چاوی تارم
بـڕوا بکـە مـن بـە بـێ تـۆ لـە بینینـی خـۆم بێـزارم
فریشتەکەم تۆ هـەتاوی، زەردەپەڕی ئێوارانی
وەرە لە ناو شیعری منا، خۆت ببینە چەند نیانی
ساتێک وەرە ناو دڵمەوە، بە ئارامی خۆت ببینە
دڵم بە تۆ ئاوەدانە ، چـونکە ژیـان خـەم و شینە
لەو رۆژەوەی تۆم ناسیوە، خۆرەتاوێک لە ناخمایە
بۆ بینینت دواهـەنـاسەی، چاوەڕوانی لە ئاخمایە
چـرای روونی ئـاسوودەیی داری ماتی ئەرخـەوانی
ئیتر بۆچی لە تاو خەمێک ، لە هاتنە بوون پەشیمانی

# چەتر

بـەهارێک دانـێ لە رێی ژیـــانم
مانگبە بۆ بەرزی تاقی ئاسمانم
باران لە دڵما خۆشـناکـــاتەوە
دە بمخەرە ژێر چەترەکەتەوە

هەر کاتێک چویتە کەناری دەریا
دڵۆپێک فرمێسک بکە بـەبەریـا
با رەنگی ئاویش وەک چاوت رون بێ
نهێنی دەریـــاش ئـــاشکراو رون بـێ

من زۆر جار خەونی ئاڵۆزم دیوە
زۆر جـاران بەخـەم دڵم تەزیوە
بەڵام هیچ جارێک دڵم وەک ئێستا
وەک هەرمێی بەر (با) هەڵنەلەرزیوە

# بۆچی؟

بۆچی ئازاری منت پێ خۆشە؟
خۆ من هەڵوەرم پاییزی تۆشە!
بۆ لە گومانا ئەمبەی ئەمهێنی؟
کە تۆ بمکوژی بۆچی ئەمژێنی؟

من بەهارێکم بێ ناونیشانم
کزەی پاییز و وەرزی گریانم
ئیتر پێم بڵێ تۆ چۆن ئەتوانی؟
زوو بەجێم بێڵی وا بە ئاسانی!

ئەترسم رۆژێک رۆژ نەبێتەوە!
خۆری کازیوەم نەگەڕێتەوە
رەنگەکان هەمووی ماتی بنوێنن
تاریکی بەسەر دیدەما بێنن!

# هەوری دڵتەنگ

من کە هەورێکی دڵتەنگ ئەبینم
ئەیکەم بە هاوڕێی گریان و شینم
من خەندە زوو زوو ژیرم ئەکاتەوە
کێ دڵنەوایی هەور ئەداتەوە ؟

بۆیە دڵی تۆ ئاوا دوو رەنگە
رەنگێکیان رونەو رەنگێکیان مەنگە
هەر من ئەزانم ئەو دڵە پاکە
وەک دڵی خونچە ناسک و تەنگە

من کە دارێکی دوورە دێراوم
بەڵام ئێستاکە شەتڵی پڕ ئاوم
هەر کە پێت وتم ئەگەرێمەوە
هەرچەند وشک بووم وا ئەژێمەوە

## فرمێسکی خۆشی

ئـەمشەو چاوانت بـدە بە دەریا
شەپۆلی خەیاڵ دەرژێ بەسەریا
تۆ لە خــەونێکاو من لــە راستییا
دەستی یەک ئەگرین تاکو ئەو دنیا

ئەمشەو رژایتە نـاخ و هـەستمەوە
فرمێسکی خۆشی کەوتە دەستمەوە
ئەستێرە هەڵهات لە شەوی تارم
بە خەندەی تۆ رۆی خەم وئازارم

چەندین بەهاری گەشم بینیوە
هەزاران گوڵی رەنگینم دیـوە
بەڵام هیچ جارێک وەک ئەم پاییزە
رەنگ بـەسـەر دڵما دانـەبـاریـوە

# هاوڕێی تەنیایی

لە ناو سەرنجی ژینی تەماویم
هەنگاوم وێڵەو هاوڕێی تەنیایم
ڕێگای شیرین و تاڵیم بڕیوە
مـەلی ئاواتم لـە دڵ تەریوە
لالەی بەهار و هەوری پڕ باران
وەکو عومری من گشتی هەڵوەران
داری خۆزگەی دڵ، گوڵێکی نەگرت
شەو چرای روونی لە من هەڵنەکرد
دوا بەفری سپی بەسەرما باری
چیبکەم هەتاوی رووناکم نەدی
دێتەوە یادم عومری رابردووم
ئومێدی وەریو رۆژی لە دەست چووم
ئالودەی ئەشکم بەیادی بـاران
بەیادی خونچەو شنەی بەهاران

## هەوری دڵتەنگ

من کە هەورێکی دڵتەنگ ئەبینم
ئەیکەم بە هاوڕێی گریان و شینم
من خەندە زوو زوو ژیرم ئەکاتەوە
کێ دڵنەوایی هەور ئەداتەوە ؟

بۆیە دڵی تۆ ئاوا دوو رەنگە
رەنگێکیان رونەو رەنگێکیان مەنگە
هەر من ئەزانم ئەو دڵە پاکە
وەک دڵی خونچە ناسک و تەنگە

من کە دارێکی دوورە دێراوم
بەڵام ئێستاکە شەتڵی پڕ ئاوم
هەر کە پێت وتم ئەگەرێمەوە
هەرچەند وشک بووم وا ئەژێمەوە

## گەڵای شکاو

ئەو کاتەی دڵت تەماوی ئەبێ
پێ بەسەر گەڵای وەریوا مەنێ
نەبا دڵی تۆش وەک گەڵا بشکێ
با هەوری چاوت فرمێسکی نەتکێ

ئەگەر بارەشێک نیگای شکاندی
مەیلی ئەو ساتەی لە لێو تەراندی
زیاتر بە خەندە بژی بۆ ژیان
مەهێڵە چاوت داکاتە باران

هەنگاو بۆ رێگەی تەنیایی مەنێ
لە پرسەی رەنگا، قەت گوڵ دامەنێ
بە مەرگی باران ، بە گیانی دەریا
هەتاو شیرینە لە کاتی کۆچیا

# ئەرخەوانی

بە ئاوی خەندە پێت نا لە دڵم
وەک زوقمی سەر ئاو شکاندت گوڵم
سوێندت بۆ دەخۆم بە هەورو باران
بەو ئەستێرەیەی کشا لە ئاسمان
بەو ڕێگا دوورەی لە نێوانمانە
کە تاسەو خەونی گشت شەوانمانە
من دابمە شەیدای ئاوێنەو چرام
بەڵام بە تەنها لەوان دابڕام
ئاوێنەی دڵم سەد جار شکاوە
چرای خۆزگەشم خامۆش کراوە
ئای لەم خەیاڵە ئەرخەوانییە
تەمەن سەر تاسەر چاوەڕوانییە

# مانگەشەو

شـەوان هێندە من بێدارم ، ڕەنگی شـەوم لێنیشـتووە
دە من چیبکەم لەم گەردوونە، مانگە شەوم خۆشویستووە
لـە نـاو دڵـی تـاریکیدا نیگـای ڕوونـی لـە من نـابڕێ
هەموو شەوێ دێتە ژووان مەگەر هەورێ ڕێی لێ بگرێ
حەزمدەکرد منیش عەشقی، گوڵو زریان و تۆفان بم
بۆ پێکـەنینی لێوی گوڵ ، نەرمـە شنەی ئێواران بم
وەکو گەڵا لە باوەشما، شەونم گیانی سپاردایە
چـڵە داری زستـانێ بم، بەفر دیلی بکردمـایە
لە ئـاوێنەی دڵی شۆخـێ، هەرمێی دڵی خـۆم ببینم
لە جێی شەوان نیگای خۆری، وەکو دیاری بۆ بهێنم
دە من چیبکەم کە من عەشقی، مانگە شەوی ئاسمانم
بـە تیشـکی خـۆر ڕۆشن نـابێ، پێکەنینی نـاو ژیـانم

## برۆ بژی

ژیان خەونی منداڵێکەو ئەبڕێتەوە
برۆ بژی ، ژیـان خەونی منداڵێکەو ئەبڕێتەوە
تەمەن وەکو بەفر وایە، کە داباری ئەتوێتەوە
برۆ بژی ، بە دەستی خۆت، دەرگای خەندە کڵۆم مەدە
تا لە ڕێتا گوڵێک هـەبێ ، سڵاو لە درک و خەم مەکە
نەکەی بە خەم فریو بخۆی ، پاییز فێری گریەت بکا
چـاوەڕوانی لـە دڵتـا بێ و بەهـار لە چـاوتـا دەر بکا
کانی ڕونیت، خۆت لێڵ مەکە، شەپۆلانبە تا ئەتوانی
گوڵ چـاوەڕێی دەستی تۆیە، نەیوەرێنی بەئـاسانی
شەوی زستان چەن تاریک، بێ بەفر رووونی ئەکاتەوە
دڵنیابـە کـە خـۆر هـەڵدێ، شەوت لـە بیر دەبـاتەوە
ژیان خەونە چەن درێژ بێ، دڵنیابە وەک ساتێکە
پڕخەندەبێ یا پڕ ئەشک دواهەناسەت هەر ئاهێکە

## سات

تۆ کە نەتوانی وەکو باران بی
بێگەرد و ساف بی وەکو ئاسمان بی
ئەی بۆچی وەک خەم لێم نابیتەوە
وەکو شەوو ڕۆژ بڕۆی دێیتەوە
کە تۆ نەیەیتە ناو ژیانمەوە
بۆ وەکو بارەش دێتە چاومەوە
وەکو تەمەنم بەجێم ئەهێڵی
ڕۆحم ئەبەیت و ناخم ئەکێڵی
ئیتر وازبێنە لە نەرمە نیگا
مەبە بە گوڵ و خونچەی سەر ڕێگا
خۆت مەخەرە ناو خەیاڵ و ئاخم
مەبە بە تاسەو هەناسەی ناخم

# وێنەی عەشق

ئەگەر نەتووانی بگەڕێیتەوە
لەگەڵ بەفرێکا ببارێیتەوە
شەوت ببەستە بە ڕۆژانمەوە
قاقات بسپێرە بە گریانمەوە

با مەستت بکەم بە زمانی شیرین
دنیات بۆ بکەم بە عەشق و ئەوین
لە گۆرانیدا وێنەت بکێشم
تا دوا هەناسە نازت ئەکێشم

لێوت شەرابی چاوەڕوانیمە
ماچی ئەفسانەو خەون و راستیمە
با لێوانی ئاڵ لێوم ئاوبدات
وەکو بارانێک لە هاوین داکات

## تەزیوو

دڵم باڵداری ڕێگەی بارانە
باڵی تەزیووم ماندووی تۆفانە
بۆ نایەیتە ناو دڵی خامۆشم
لوتفی شیرینت وەک مەی بنۆشم

من کە تۆم ناسی گریان بوو ناوت
ئێستاکە لای من نییە هاوناوت
دە زوو پێم بڵێ وا من هەڵوەرام
با خامۆش نەبێ تروسکەی چرام

بە دەریا بڵێ شەپۆل ڕاگرە
بە هەور بڵێ بارانت ببڕە
تا گوێت لە دەنگی ترپەی دڵم بێ
ئەوسا لەگەڵ دڵ هەنگاوت بنێ

# چۆڵەوانی

گەر هەواڵی من دەپرسی، وەک ڕەشەبا سەرگەردانم
وەکو گوڵی وشکەساڵی، لە ڕەنگی خۆم پەشیمانم
گەر دەتەوێ بزانی کێم، چاوی سووری پڕ گریانم
وەکو هەور دڵم تەنگەو دایمە عاشق بەبارانم
دیـوانی مـن تـەنیـاییـەو نـاونیشـانم دابـڕانـە
وەرزی گوڵ و شنەی باخم، هەڵوەرین و هەر خەزانە
من دەفتەرم گەڵای زەردە و پێنوسیشم داری سووتاو
ڕۆژی هەینیم دیدارێکە و گوڵی سەر گۆڕی بەجێماو
چرای ڕونم مانگەشەوە، کە هەور بێ ئەویش ماتە
لە چیرۆکی تەنیایما، تاسەو ئاخ و مەرگەساتە
ماڵی من وا لە دڵمایە، ئەویش چۆڵە وەکو بیابان
پێکەنینم هەڵوەریوە، وەکو گوڵی دارئەرخەوان

# وەرزی گۆچان

من گۆچانێک دەستم ئەگرێ و درەختێکی پیر هاورێمە
سایەی باڵام لەگەڵما دێ ، ئەویش هاورێی نیوە رێمە
هەموو شەوێ با دەبینم، لەگەڵ گەڵا سەما دەکا
رەشەبای وەک خۆم سەرگەردان زوو زوو لە دەرگای من ئەدا
رەنگی من وەک رەنگی ئاوە، کەس نازانێ چ رەنگێکە
دەنگی من ناڵەو هاژەیە، پڕ بە گەرووی گشت دەنگێکە
کاسەی دەستم پێکی خەمە، بە بێدەنگی خۆم ئەینۆشم
بە بێ بادە وا راهاتووم، مەست و بێ ئاگاو سەرخۆشم
لە دایک بووی پرسەخانەم، کوڕی خەم و لاوانەوەم
چڵەداری شکێنراوم، چاوەڕوانی هەستانەوەم
ژووری ساردم بەرەو باران، جار جار هەتاو دێتە ژوورێ
لاولاوی دیواری حەوشەم، پڕ باڵای خۆی گوڵ ئەدورێ

## دێتە بیرم

گۆرانی من ئاوازێکە، لە گەرووما نایەتە دەر
خۆشەویستیم لێ ون بووە، تەنییایشی هاتۆتە سەر
دێتە بیرم یەکەم شەوم، کە ئەستێرە خۆی ناسان پێم
یەکەم رۆژی خۆرم بینی، سێبەرەکەم کەوتە شوێن پێم
یەکەم باران بە چاو بینیم، ئێستا لە چاوما دائەکا
یەکەم تاڵی بەفری ئاسمان، ئێستا بەسەرما دائەکا
باران زۆر جار تەڕیکردووم، ئەشکی بە من ناساندووە
خۆری مەغریب نەک هەر باڵام، سێبەریشمی شێواندووە
وەکو شەپۆل لە دەریاوە، بەرەو کەنار بەڕێکەوتم
وەک چۆن گەڵا باخ جێدێڵێ، دوای رەشەبای نامۆ کەوتم
شەوی سپی و رۆژی رەشم، تێکەڵاوی یەکتر بووە
نەک رۆژانی رابردووی خۆم، داهاتووشم بەسەر چووە

# دووری

دوریت هێندە ئازار بەخشە، دڵی منی سڕکردووە
زەردەخەنەی لێوەکانم، تازە خونچەی بابردووە
لە دوریتا دڵم تەنگە، نیگای رونم شەوی تارە
کە تۆ نەبیت لە تەمەنما، هەرچوار وەرزم بێ بەهارە
دە من چیبکەم گوڵی هەستم، کە دنیایەک لە من دووری
تەنیا چرپەی وێنەکانت، بۆ دڵم بوونە سەبووری
ئەی دڵە غەریبە دوورەکەم، ئەی هەناسە شیرینەکەم
کەس شک نابەم ساباتێ بێ، بۆ گریان و ئەسرینەکەم
رەنگە ئێستاش تۆ لەوێوە، بەم ئەوینە بتلێیتەوە
دڵت هێندە سارد و سڕ بێ، بەگڕی خەم بتوێتەوە
دڵنیابە من ناتوانم، بە بێ یادت ساتێک بژیم
گریان و خەندەی تۆم نەبێ، خۆشم نازانم کە من چیم

## مەستە نیگا

هەر رۆژێ کە ئەتبینم نازئەکەی بە رێگاوە
خۆت لامەدە لە رێگەم دڵ هانای بۆت هێناوە

چاوانت خۆرەتاوە دەم بە خەندەو شیرینی
مەستە نیگات پێم ئەڵێ تۆ فریشتەی ئەوینی

رازو نیازی تۆیە لە دڵما داگیرساوە
عەشقت کانی بەهارەو لە ناخما هەڵقوڵاوە

کازیوەی رونیش وەک تۆ بە نەرمی دێت و دەچێ
وەکو شەونمی بەهار بەسەر گوڵ هەنگاو دەنێ

## کانیاوی ئەوین

دڵی من ئەشکینی     هەر خەمم بۆ دێنی
پێم بڵێ بۆ ئازار     لە ناخما ئەچێنی

من وێڵ و رێبوارم     چاوەڕێی بەهارم
هەناسەو نیگای تۆ     بە ڕۆحم کریارم

ئاوێنەی دڵی تۆ     شەیدا بووم سەرەڕۆ
نازانم من بۆچی     زوو کەوتمە داوی تۆ

هەرچەندە شیرینی     کانیاوی ئەوینی
بەڵام بۆ تەنهاییم     دەریایەک ئەسرینی

وەرە لام فریشتە     دڵم تۆی مەبەستە
بەعەشقی تۆ دەژیم     بۆ تۆیە ئەم هەستە

# غوربەت و دووری

هەتا بڵێی بیرت ئەکەم، پێم خۆشە گوێم لە دەنگت بێ
وەک بەهاری باراناوی، چاوم لە جوانی رەنگت بێ
بریا دەبووم بە خەونێک و ئەهاتمە ناو چاوانتەوە
یا دەبوومە ئەستێرەیەک، ئەکشام بەسەر ئاسمانتەوە
بەڵام چیبکەم کە لێم دووری، نێوانمان پڕ ئۆقیانوسە
دە هیچ نەبێ نامەیەکی، پڕ لە خەندەم بۆ بنوسە
گەڵایەکی هەڵوەریوی، نیشتمانم بۆ بنێرە
بەڵام توخوا بە ئاگابە، نەشکێ هەتا دێتە ئێرە
تۆ دەتوانی بێیتە خەونم، لەم غوربەتە رزگارمکەی
هێند بە تاسە بانگم بکەی، لە کوردستان بێدارمکەی
بەختی نوستوو چرۆ دەرکە، خەونێکی لێڵ دایپۆشیوم
لەگەڵ ئەشکا بموەرێنە، وا خەم رەنگی پێ نۆشیوم

## باخی شیعر

زۆر جار وشەی جوانم هێناو کردمە شیعر و بۆ تۆم نوسی
تۆ نەتوانی وەک ملوانکە، بەسەر دڵتا هەڵی واسی
پرچتم کردە شەوەزەنگ و ئەستێرەم بەسەریا باراند
مۆمی چاوم تا بەیانی، بە خەیاڵی تۆ ئەسووتاند
دەستە گوڵم لە باخ هێناو لە ناو شیعرا ریزم ئەکرد
نیگای چاوتم بۆ ناو تاڤگەی، میرەبانی ئەوین ئەبرد
وەک چۆن بەهار لەگشت رەنگێ گوڵ دائەنێ لەدەشت و دەر
منیش بۆ تۆ هەموو شیعرێ، رەنگێکی نوێم ئەکردە بەر
تۆ لە رەنگی خۆتا جوانی، وەکو هەتاو لە ئاسمانا
وەکو خەندەی منداڵی خۆم، لە ناو ئەشک و یادەکانا
مانگ لە شەوی نیگەرانی، دڵی بە خۆر ئەکرێتەوە
گەر بەفریش بی لەگەڵ باران، تاسەر نابی و ئەتوێتەوە

# ئێشکچی

وەک مانگەشەو ئێشکچی بووم، روو لە تیشکی چاوخۆرەتاو
هێندە تینووی دیدارت بووم ، وەکو بیابان بۆ قومێ ئاو
ئەی نازانی بە بێ عەشق ، وەک شازادەی بە بێ تاجی
چەن شەپۆل بەی لە ناو یادا، هەرگیز بەرەو کەنار ناچی
بەفر نەبووم بەڵام گوڵم، لەگەڵ تۆدا زۆر بێگەرد بووم
نەباران بووم نەهەورو تەم ، بۆ فرمێسکت ئاهی سارد بووم
چەن وەرزی سارد بەرێ بکەی، ناگەیتەوە بەبەهارم
ناگەیتەوە بە چڵ و چێوی، هەڵوەریوی درک و خارم
رۆژ کە دەڕوا ئاوا دەبێ، تین و تیشکی خۆی ون دەکا
لە مەغریبا بەیەکجاری سیماو رەنگی لە دەست ئەدا
تۆش خەونێک بووی نەهاتیە دی و تەنیا جارێک خەو بینراوە
خەونی لێلیش بێ تەعبیرە و لە ناو یادا ئاڵۆزاوە

## هەتاوی ناو ئاوێنە

لەبیرم دێ ، بە منالّی ، گوڵی زۆرم لێکردەوە
لە هەر باخێک بمتوانیایە ، چڵ و چرۆم ئەشکاندەوە
رۆژی باران زۆر گۆلاوی ، ئاوی وەستاوم ئەشڵەقان
زۆر نەمامی راوەستاوم ، بەڕاوەشان لە خەوهەستان
شەوان زۆر جار ئەمبژاردن یەک بە یەکی ئەستێرەکان
بەڵام ریزم لێتێک ئەچوو ، نەدەگەشتمە دواهەمینیان
حەزمدەکرد هەتاو بگرم، لە ئاوێنە دیلی بکەم
تیشکی روونی لە چاوانی هاوڕێکانی خۆشم بدەم
من زۆر قینم لە دەرگا بوو کاتێ لە سەرم دادەخرا
زۆر دەگریام کە من دەستم لە دەستی باوکم دادەبڕا
بەڵام ئێستا گەورەبونم ، بیرو هۆشی لێم گۆڕیوە
واهەستەکەم قەت ئەستێرەو خۆرەتاوم نەناسیوە

## تەلار

هەموو ڕۆژێ تۆ دەبینم ، وەک تیشکی خۆر دێتە خوارێ
رووت ناتوانێ ونی بکا ، کە غەرق بووی لە ئازارێ
ئەم تەلارەی تۆی تیا ئەژی، ئاودامانە لە تەنهایی
کۆشک هەرچەن لە هەورا بێ، پڕ سنوورە بۆ جودایی
تۆ ئێستاکە دڵت ماتەو لە ناو خەما هەڵکورماوە
چرای عەشق زۆر دەمێکە لە تەلارا کز کراوە
زۆر دەمێکە نەتبینیوە خەونێکی مەست نیگای شیرین
لە باوانت بەسەر چووە باوی نەما عەشق و ئەوین
بەڵام دیارە تۆ وەک فووارە بۆ ئەوینێک ئاوهەڵدێری
دیارە بۆ سۆز سەرگەردانی و بە چاوت پەیام ئەنێری
بەڵام داخم کچی تەلار کە ناتوانی بگەی بە خۆر
چونکە ڕێگەی تۆ پڕپەتی شەوی لێڵ و سامانی زۆر

# ڕەنگی ئاو

زۆر دەمێکە ئاسمانی من مانگی ڕونی لێ ون بووە
بەهار لەگەڵ خۆیا کە دێ پاییزێکی هەڵگرتووە
زۆر دەمێکە کانی دڵم سەرچاوەکەی لێڵ کراوە
مەلی خۆزگەم لە هێلانەو ئاسمانی خۆی دابڕاوە
وەکو کۆتر لە گۆمی لێڵ نەتوانێ ئاو بخواتەوە
سێبەری خۆی بەجێدێڵێ و بە ناچاری ئەڕواتەوە
وەک ئەستێرە لە نێو تەما دوا جریوەی ڕەشپۆشیمە
ڕەنگی ڕۆشن نەک هەر بۆ خۆم بۆ چاوی تۆش هەبێ نیمە
تۆ باران بۆ من دەهێنی و منیش ڕەگم وشک بووە
تەرمی دڵم لە ژێر خاکی سینەی خۆمدا زوو ناشتووە
هێندە تەنیام لە تەنیایی ، وەک دارتێلی سەرە ڕێگەم
خۆم داوەتە بەر هەرەسی باوزریانی خەون و خۆزگەم

# فریشتە

له فریشتەی ئاسمان ئەچی ، لە بەرگێکی سپی رەنگا
وەک پەیکەری بەفری بێگەرد ، لە سروشتی شۆخ و شەنگا
تۆ گوڵیت و لەگوڵ ناچی ، چونکە گوڵ زوو هەڵدەوەرێ
کە دێی بۆ لام ئەڵێی خۆری ، لە سپێدە دێیتە دەرێ
بیرتە جاران هەموو رۆژێ بەتریفە سوێندت ئەخوارد
چرکە چرکە بەرەو لای من کاتەکانی عومرت ئەبژارد
لەگەڵ خۆتا نیگای مەست و بزەی شیرین ئەهاتنە لام
من بە شنەی خۆشەویستی و پێکەنینی تۆوە ئەژیام
پێنوسێکی بیرەوەریت شەوو رۆژی من دەنوسی
ئەستێرەی گەش بە ئاسمانی شەوی تارما هەڵدەواسی
لەوسا زیاتر بە بای سۆزت دڵی سەوزم ئەشنێتەوە
لەناو ژینی تەماویما تۆ خۆریت و هەڵدێیتەوە

# میهرەبان

ناباوەڕی لای تۆ نییە ، دەریایەکی میهرەبانی
چونکە زوو زوو من دەبوری و لە بەخشینا بێ گومانی
تینی عەشقت لە دوورەوە ، وەکو خۆری لای هاوینە
بێگەردبونت ناونیشانی ، شاری عەشقی پڕ ئەوینە
ئاسمانی تۆ گوڵبارانەو چیمەنی ڕێت نەرمونیان
بۆ دیدارت هەوریش پڕە ، تا داکاتە ڕێژنەی باران
ڕەنگی بەهار لە چاوتایەو گەڵاوەرین لەبەر پێتە
دڵی بەفر لە ناختایەو چەتری وەفا هاوڕێی ڕێتە
من ناتوانم هەرگیز گوڵێ وەکو دیاری بۆ تۆ بێنم
نەک بە جوانیت دڵی خونچەی بەهاریشی پێ بشکێنم
دیارە کە خۆت نەتزانیوە خودا چۆنی دروستکردوی
لە ڕەنگاڵەی ڕوخساری تۆ گوڵیش جوانی خۆی لێ بردوی

# چرپای خەون

ئەی تەنیایی، بمشارەوە ، وەک چۆن گەڵا چڵ ون ئەکا
وەک چۆن بەفر کە دەبارێ ، ڕەنگی هەموو ڕەنگێک ئەبا
وەک ئەستێرە کە هەور دێ و بەرگی ڕەشی ئەکاتە بەر
ڕێم لێونکە و کەسم ناوێ، من تەنهایم کەوتۆتە سەر
بمشارەوە ، وەک ئەو مەلەی ، کاتێ ئاسمان ونی ئەکا
وەک غەریبێک لە شارێکا ، لە دەرگای دڵی خۆی ئەدا
وەکو باران تا دێتە خوار ، بەر دڵۆپی تر ناکەوێ
هەر بە تەنها خۆی ون ئەکا و مەرگی خۆی بە تەنها دەوێ
لەگەڵ خۆتا بمبە بەرەو ، چرپای خەون و دەریای خەیاڵ
چی لە ڕۆژکەم، چی لە شەوکەم، دەرمبێنە لە وەرز و ساڵ
دەستم بگرە بەرەو ڕێیەک ، کە هیچ کەسی لێوە نەیێت
نەک سانا بم جارێکی تر ، دڵم بەر دڵی تر

# بڕ باکر

خۆزگەم بە خۆت کە بێباکی و رابردوو بە مەستبوون ئەزانی
ئاو بنێژرێ و باران بمرێ لە تۆ نابینن گریانێ
گەڵاکان کە سێبەر بوون بۆت ، تۆ بێخەمی کە وەریون
ئەو رۆژانەی تۆ جێت هێشتوون ، وا ئەزانی نەتبینیون
ئەوگوڵانەی باخیان چۆڵکرد ، کە بە دیاری گەیشتنە دەستت
ئێستا بۆنی پاییزبوونیان ، ناگا بە بیابانی هەستت
ئەو رێگایەی پیای تێپەڕیت ، شوێن پێکانتی هەڵگرتووە
بێوەفایت وەک تەپوتۆز ، بەسەر ئەودا داکردووە
وەکو بارەش هەنگاو دەنێی ئاوڕ بۆ دوا نادەیتەوە
دڵی هەزاران چڵ بشکێ ، لە رێی خۆت سارد نابیتەوە
خۆزگە منیش بمتوانیایە ئەو یادانەم لە چاڵ نایە
نەک بە خولیای بیرەوەری ئاهی ساردم هەڵکێشایە

# ملوانکەی درەخت

پاییزێکی چەن غەمگینە ، تەنیا دڵم نەوەریوە
درەختەکان لەبەر چاوما ڕەنگی پرسەیان پۆشیوە
گەر دەمتوانی گشت گەڵاکان ، وەک ملوانکە دەمهۆنییەوە
جارێکی تر بە گەردنی چڵا هەڵمدەواسییەوە
هەتاوی سارد ماندوو بووە ، لە ڕۆژی کورت و ڕەشەبا
ئاخۆ گەڵای ئەم چڵانە بۆ کام سووتان بێخەم ئەبا
وا کۆڕەوی گەڵای زەردەو هەموو هەڵدێن لە دەست خەزان
باڵای درەخت لە تاو باڕەش بەیەکجاری کەوتۆتە ژان
بەڵام ئەفسوس هیچ گەڵایەک ناونیشانی لەسەر نییە
کەس نازانێ لە کام باخن ، لە کام دار و ناویان چییە
کەس ناتوانێ خۆشەویستی و عەشقی سەوزیان هەڵباتەوە
دواسڵاوی کۆچکردنیان بە ڕەنگی زەرد بکاتەوە

## ناسینەوە

راستە من و تۆ بوین بە ڕۆژ و شەو
ناگەینەوە یەک ، تەنانەت بە خەو
شێوەی یەکترمان لە بیر نەماوە
دەرگای یادیشمان کڵۆم دراوە
وەکو دوو هەور هاتین و بارین
دوو مەلی ڕێ بوین لە یەکتر تەرین
دوو ئەستێرە بوین لە یەک ئاسمان
تاریکی شەوگار کەوتە ناو ڕۆحمان
کە یەکمان بینی ورد بوین و مناڵ
ئێستا گەورە بوین جێمان هێشت چەن ساڵ
تازە ناتوانین بگەڕێینەوە
وەک جاران یەکتر بناسینەوە

# دوا خەون

دوایم هێنا بەو خەونانەی کە ئازاری ڕۆحیان ئەدام
بەو ئومێدەی لای تۆ دامنا ، کردبوومە خۆزگەو خولیام
دوایم هێنا بە پێکی خەم ، بە هەناسەی ساردو تەزیو
بە بینینی ئەو چاوانەی تا ئەم عومرە ئەشک نەدیو
چاوەڕوانیم بەیەکجاری لە دڵ و چاوم سڕییەوە
ئەو ڕۆژانەی لەدەستم چوون ، هەست و هۆشم کڕینیەوە
دوایم هێنا بە ناشتنی ڕۆژەکانم لە ڕێی تۆیا
تۆ دەریا بیت من بیابانم، بەیەک ناگەین لە هێچ ڕێیا
دوایم هێنا بەو درۆیەی کە تۆ ناوت لێنا ئەوین
بەو شەتڵانەی من رواندم ، هەمووی لای تۆ بێشک وەرین
ئاسوودەم بە خامۆشبوونمان کە خۆم دوایم پێهێناوە
داری وەفا چەن سووتا بێ خۆڵەمێشی بەجێماوە

# تۆش وەکو من

تۆش وەکو من پێکەنینت لە گریانا بەجێماوە
وەک نەمامی دەم ڕەشەبا ، چڵ و چرۆت لێ شکاوە
دیارە کە تۆش بێدەنگ بوونت حیکایەت و ڕۆمانێکە
ئەفسونگەریی تەنهایی تۆ، وێران بوونی ژووانێکە
لەگەڵ خەندەش ئاو لە چاوتا شەپۆل ئەدا بێتە دەرێ
وەکو ماسی بۆ دوانیگا ، تا لە گۆما بێتە سەرێ
سێبەرێکی ماندوو شەکەت ، بە شوێن خۆتا رادەکێشی
بێگومانم تۆش وەکو من ، هەر تاڵاوی خەم دەنۆشی
وای دەبینم کە تۆش وەک من دنیای عەشقت سەرابێکە
مەستی ئەوین تەمەن کورتە وەک مەست بوونی شەرابێکە
تۆش وەکو من دڵت پڕە لە تەنهایی و خەم و گومان
پەشیمانی لەو ڕۆژانەی کە بۆ کەسێکت هەڵوەران

# گڕو ئاو

زۆر جار هەور چارشێوی ڕەش ئەدا بەسەر خۆرەتاوا
ئەمە عەشقە یان کینەیە ، لە نێوانی گڕو ئاوا
ئاخۆ بارەش ئاسوودە بێت ، بە وەرین و بە چڵ شکان
ئەویش لە تاو تەنیاییدا ، خۆی دابێتە دەستی زریان
رووبار خەونی نایەتە دی ، چونکە ڕێگەی سەرەو لێژە
خۆر بەشەوی تاریک ئەڵێ ، دوا ئەستێرەم بۆ بنێژە
ڕێگا چاوی لە کاروانە و ڕێبواریش پیا تێناپەڕێ
هەور بە ڕێژنە دائەکاو بۆ ڕەزو باخ ناگاتە جێ
پاییز بۆچی لە هەڵوەرین وەڕز نابێ و پشوو بدا
چەن پەروانە بسوتێنێ ، مۆم شەوقی خۆی زیاتر ئەکا
ئەمە خەمی سروشتێکە کە من و تۆ بێهەستین بۆی
باکمان نەبوو لەو بارانەی ، کە گیانی داو زوو هات و ڕۆی

# دووری و خەون

خەونم بینی وەکو راستی ، چاوت کەوتە ناو چاومەوە
دڵت خستە دەشتی سینەو ناو دەریاچەی هەناومەوە
هەردوو دەستت کردە ملم و هەستم ئەکرد بوین بە پەیکەر
بەڵام داخم زوو داچڵەکیم ، لەو خەونەدا هاتمەوە دەر
هاتمەوە نێو دووری و خەیاڵ ، ناو ئەفسانەی چاوەڕوانی
نە خەونی خۆش ، نە راستی تاڵ ، هەواڵی تۆیان نەهانی
من دڵنیام تۆ ئێستاکە بە خۆرەتاو چاوت ئەشۆی
دڵت وەکو دۆڵفین ئەدەی بەدەم دەریاو و هەر ئاخ ئەخۆی
هەنسک ئەدەی بۆ دوورییەک ، کە نێوانمان باوبۆرانە
وەک هاواری ئەو باڵدارەی لە قەفەسدا ناشتوویانە
لە خاکی خۆت غەریبییەک ، رژاوەتە ناو ناختەوە
منیش لێرە بەم خەونانە ، دڵم سپارد بە ئاختەوە

# شەوی سپی

ئەی ئاسمانی پرسە پۆشیو ، شەوان کەمێک کاڵبەرەوە
کەمێک بەسەر دڵتەنگیتا ، بەر لە بەیان روون بەرەوە
بریا هەموو رەنگەکانت ، بە دڵی خۆت ئەکردە بەر
نەک هەوری رەش بە بێرەنگی ، تاجی لێڵیت بنێتە سەر
ئەی ئاسمانی شین و رەشم ، هەموو رەنگێک لە تۆ جوانە
دەریاو دەشت و بیابان و شاخ ، دڵیان بە تۆ ئاوەدانە
مەهێڵە رۆژ هەوری تاریک ، سەیوانی رەش داباتەوە
سروشت بکات بە رەساسی و تیشکی هەتاو کەمکاتەوە
شەوان ئەڵێی چەتری رەشی ، بەسەر زەوی هەڵت داوە
وەک پەڕی گوڵ شەونم لێیدا ، ئەستێرەت لەسەر داناوە
خۆزگە شەوێک سپی ئەبووی وەک چۆن بەفر خاک دەگۆڕێ
هەتا چاوی شەوی تارم ، بۆ نیگای رونت بنواڕێ

# هاوڕێی غوربەت

هاوڕێی غەریبیم دیارە دڵتەنگی
هەروەکو چالاو بێدەنگ و مەنگی
ئەزانم خەمت ئاهی وڵاتە
بۆیە وا ئەمشەو ئەستێرەت ماتە

چەن دوربین هاوڕێ لەو نیشتیمانە
ئێرە بۆ ئێمە غەریبستانە
دڵئارام نابین دوربین لە ئەوین
دور بین لە خۆری ئاسمانی بەتین

ئەزانم دڵت وەک گوڵ پەڕ پەڕە
کازیوەت لەناو دەستی قەدەرە
تەنیایی ئێرە دڵت ئەنێژێ
غەریبی زوو زوو ڕۆحت ئەکێشێ

# دەربەندی عەشق

نیگات پڕپەتی لە نازو خەندە
دڵم بەداوی ئەو نازە بەندە
بە نەرمە نیگا هێندە شیرینی
کڵۆی نەبات و نمەی هەنگوینی

ڕێگا بە جوانیت ئارایشت ئەکەی
شەوقی خۆرەتاو لە ئاسمان ئەخەی
ئەڵێی ئەستێرە لە تۆ باریوە
بریسکەی پرچت لە ڕەنگی زیوە

دڵت بێگەردەو نەرمو نیانی
دەربەندی عەشق و تاڤگەی ژیانی
هەناسەی بەفر و بۆنی بارانی
بەراستی گوڵم تۆ میهرەبانی

# نامەی باران

قەت دڵم درۆی لەگەڵ نەکردووم
هەر تەنیا چاوم فریوی بردووم
ئەوەی بەچاو دیم زۆری وانەبوو
دەریا و ئاسمانیش لێکیان نەدابوو

بەهەور مەڵێ بۆ رەنگت بۆرە
تا دواهەناسە گوڵ شەیدای خۆرە
هەور پۆستەچی ئاوی بارانە
هەموو دڵۆپێک نامەی گوڵانە

ئەستێرە بە رۆژ ئەکوژێتەوە
خۆر لای ئێوارە سەر ئەنێتەوە
هەست بە تەنهایی و بەندی زۆر ئەکات
بۆ گۆشەی خەڵوەت هانای خۆی ئەبات

## مروارى

ویستم بڕۆم بەجێت بێڵم ، وەکو گەڵا لە چڵ بڕوا
بەڵام زانیم کە ناتوانم ، دوریت زیاتر ناخم ئەخوا
واپەیوەست بووم بە عەشقی تۆ وەکو دەریای چاو لە هەتاو
لە دوریتا ئارام ناگرم ، دڵ و گیانم ئەبن بە ئاو
من ناڵی و مورویی شیعرم ، هەمووی لای تۆ هۆنینەوە
زەردەخەنەم لێ ون ببوو ، لە ناخی تۆ دۆزیمەوە
تا دوا نیگا سەفەر ناکەم ، چونکە بەرگەی دوریت ناگرم
باڵداری بێ هێلانەش بم ، هەر بۆ لای تۆ من باڵئەگرم
من دەزانم لێرە نەبم ، وەکو ئاهووی دیل و ماتم
چیرۆکێکی پڕ تەنهایی و تاسەباری بێ ئاواتم
خۆشەویستم جێت ناهێڵم ، ئەی وڵاتی دواهەناسەم
تا هەمیشە عاشقی تۆم ، ئەی ساباتی دڵ و تاسەم

# نیشانە

دڵم دەردی زۆری کێشا ، وامدەزانی بێتاوانی
لە من وابوو تۆ فریشتەو کانی روونی چیاکانی
تا لە خۆشم نەدەبووڕام ، بۆچی دڵتم وردو خاشکرد
بۆ بەهارتم هەڵوەراندو بەرەو پشکۆی خەزانم برد
بەڵام ئێستا زانیم کە تۆ ، وەکو مەلی بەهارانی
بۆ گەرمیان و کوێستان کردن قەدری هێلانە نازانی
هۆگر نابی بە هیچ باخێک ، تۆ سەرەڕۆی هەر میوانی
لەگەڵ خۆشتا قەت هەڵناکەی تەنیا لەباڵدان ئەزانی
وەکو بەفر هاتی و رۆشتی توایتەوە بەیەکجاری
لە دوای خۆتا نیشانەیەک بەجێنەما بێتە دیاری
نە ئازارو بیرەوەری لە دوای تۆدا جێنەماوە
دڵنیابە هیچ یادێکت لە ناو دڵما دانەناوە

## مەستی

مەستی بۆ ناخمان وا هەنگاو ئەنێ
شەرابی چاومان زوو تێکەڵ ئەبێ
بەزمانی دەریاو تاڤگەی نیگامان
شەپۆلی عەشق هاتۆتە ڕێمان

روناکی دڵمان یەکتر بانگ ئەکا
شنەی خۆزگەمان هێمن سەرئەدا
داری مەبەستمان چرۆی گرتووە
ئیتر بۆ شەرم تۆی دیل کردووە

بە چڵی گوڵێک بمنوسەرەوە
وەک ڕێی مناڵی بمناسەرەوە
لە ژێر پەرچەمی ڕێژنەی بارانا
بای هەناسەیەک هەڵکە لە ژووانا

# بەهاری عەشق

چۆن ئەتوانی لە یادمکەی ، خامۆشمکەی بەیەکجاری
لەسەر باڵی کەشتی عەشقیش ، بۆ کەنارم پەشیمانی
شەپۆل ئەدەی هەر دێتەوە ، بۆ بەنداوی ئارامی من
وەکو پاییز دڵت تەنگە ، بۆ ساباتی هەواری من
ئەگەر بێ من، ئەستێرەش بیت ، چاو لە خاکی رێگەم ئەبڕی
دنیات باخ و هێلانە بێ ، هەر بۆ لای من تۆ باڵ ئەگری
خۆشەویستیم دەرگایەکەو تۆ لەسەر خۆت داتخستووە
کزەی سارد و یادەوەریم ناخ و دڵی تۆی بەستووە
باوەڕناکەم تۆ بتوانی رەنگی عەشق کاڵ کەیتەوە
لە ناو شەوی چاوەکانتا خۆر بۆ دڵت ببەیتەوە
لە ژوورێکی تەنیایدا ئێشکگرو چاوەڕوانی
وەک گەڵای زەرد لە دوا نیگای نەوبەهارت پەشیمانی

# باڵدار

ئەمشەو باڵدارێک وەک منی تەنیا
هەورو بارانی دابوو بە کۆڵیا
بروسکەی ئاسمان هەنسکی ئەدا
باڵی تەزیوی دابووە بەر با

تەنیا باوبۆران بێدارە ئەمشەو
هەتا ئەستێرەش چاوی چووە خەو
بێداری من و ئەم باڵندەیە
لەگەڵ تەنهایی سەد ئەوەندەیە

ئاخۆ سەفەری ئەم مەلە جوانە
بۆ کام کازیوەو خۆری بەیانە
بۆ کام هێلانەی عەشق و ئەوینە
وا ئەمشەو هێندە باڵی بەتینە

ئەڕوا لە دەرگای ئاسمان ئەدا
لە ناو تریفە هێلانە ئەکا
وامزانی ئەویش دڵی ون بووە
شەو بەسەر ڕێیا زوو دایکردووە

لە ئاوێنەی شەو خۆی نەناسیوە
پۆلەی باڵندەی لە دەست تەریوە
بۆیە زەویشی گرتۆتە باوەش
سەوداسەر بووە بۆ هەتاوی گەش

بەڵام ئەو وەک من ناچێتە ژێر خاک
ئەڕوا تا دەگا بە ڕۆژی رووناک
درەختێک ناکات بە نیشانەی خۆی
بۆیە وا بێدەنگ لەگەڵ خۆیا ڕۆی

# خۆشنووس

وەرە خۆشنوس حەرفی سپیم ، لەسەر گەڵا بۆ بنوسە
بەر لە مەرگم شیعرێکی سەوز ، لەسەر رێگای ئەو هەڵواسە
تۆ وەرە ناو ئیلهامی من کە چۆن وشەم ریزکردووە
تەهی دڵم بۆ سەمفۆنیای ئاوازێکی نوێ بردووە
گوێ لە ترپەی دڵم بگرە ، هەر گۆرانی و رەنگبارانە
بۆ شنەباو دواهەوارم ، خۆشەویستیم ژەنیاریانە
قامیش بێنەو بۆم بنوسە ، بمبەرەوە بەرەو دواوە
تۆ ئەزانی دواهەناسەم لەم شیعرەدا بەجێماوە
بمبەرەوە بۆ یەکەم رۆژ ، کە قەڵەمم گرتە دەستم
نەک بۆ ئێستا لێوان رێژە ، دوا تەمەنی مات و پەستم
وەرە خۆشنوس لەسەر تەختی بەردی کێلم هیچم ناوێ
تا دێر نەبووە بۆم بنوسە ، ئەوا ئاوی چاوم دایێ

# دورکەوتنەوە

تۆ پێت وایە ئەم دوورییە ، ئۆقیانوسی نێوانمانە؟
ئەگەر دڵمان بەلەمیش بێت ، بێ چارۆکەو دەریاوانە؟
دوری نەبوا من لە خەونا تۆم نەئەدی هەموو شەوێ
تۆ راوکەری ماسی چاومی و دەچمە تۆڕی شیرین خەوێ
بەڵام دوری فێری کردین، وەک شەوو رۆژ دوای یەک کەوین
هەرچەن دور بین بەیەک نەگەین ، زیاتر لە تاو یەک نەسرەوین
دورکەوتنەوە وایکرد گوڵم لە ناو چاوی یەکا بژین
دڵمان بۆیەک بوو بە چاوگەی ئاوهەڵدێری رونی ئەوین
وەک چۆن باران دور بێت لە گوڵ لە تەیمانی وشکەساڵی
هەرچەن دوری لافاوێ بوو ، عەشقی لە دڵ رانەماڵی
گەرئەمجارە بەیەک بگەین،وەک دووشەپۆل بەیەک ئەگەین
لە تاو دوری گەورەترین تاڤگەی عەشق دروست ئەکەین

# دوا رەنگ..!

لەیادمکە، وەکو بارِەش، کە چۆن ڕێی خۆی لە یاد ئەکا
وەک چۆن بەفر کە دەبارێ، خاک هەوریشی لە یاد ئەبا
لێم دورکەوە وەک ئەو ئاوەی کە بە شاخا سەرناکەوێ
دەستم بەردە وەکو گەڵا، کاتێ لە چڵ دائەکەوێ
سەردەمێکە من ئێواران ، خۆرنشینم لەبەردایە
بەفر هەرچەن پەیکەرسازبێت، ماڵئاوایی لەسەردایە
هەتا هێزم هەبێت بڕۆم ، تەنیایی لێم نابێتەوە
دڵم ئەگەر نەمامیش بێت، چۆن لە زوقما بڕوێتەوە
بانگم مەکە بۆ لای خەندە ، نەگ گریانت بێدار بکا
نەک بارانی دڵی تەنگم ، خۆری چاوت بێزار بکا
من ئەترسم دڵت پڕ بێ لە خەیاڵی تەنیایی من
نیگات رەش بێت بە دوارەنگی ماڵئاوایی و جودایی من

# ئاشنایی

زۆر دەمێکە ئاشنایم ، لە چاوی خۆر ونکردووە
وەک ئەستێرەی لەچاو ون بوو، پێم بە دوای شەو هەڵگرتووە
وەکو هەتاو دڵم دانا ، لەسەر سنگی نەرمی دەریا
بەڵام چبکەم کە شەپۆلی باو زریانێک هات بە گژیا
مۆم کەسووتا، تا دوانیگای هەموو جەستەی بوو بە فرمێسک
تا دوا تنۆک لە ناو ئەشکا ، سەری دانا دەم بە هەنسک
من لەو هەورە سەر دەرناکەم کە ڕەشپۆش و پڕ گریانە
کە چەخماخەو دوا بروسکەش ، لە تاو کۆچی هاواریانە
من خەونێکم نەبووە راستی و دڵی بەردێک رانەچڵەکی
ئەو یادانەی جێیانهێشتم وەفایەکیان لێنەترەکی
وەک هێلانەی پەڕەسێلکە دڵم هەر ڕەش ئەچێتەوە
گەر خەمێکم وشک ببێ ، ئازارێکم ئەژێتەوە

# کینە

له پاییزا گەڵای ڕۆحم زەرد ئەبێت و هەڵناوەرێ
زۆر حەز دەکەم مەلی دڵم، لە سینەمدا بێتە دەرێ
من نازانم ئەم خەزانە ، بۆچی ئاوا دڵتەزێنە
توخوا دڵی ناو قەفەسی، سینەی منیش هەڵوەرێنە
کە ئێوارەی پاییزان دێ، غەریبییەک دامدەپۆشێ
ئەڵێی داری سنەوبەرم، کە گەڵای خۆم لێبخرۆشێ
من ناتوانم بە تەنهایی ، لەناو خەما رابمێنم
بە شوێن گەڵای کۆچکردوودا بەیەکجاری هەرەس بێنم
خۆ تۆ هەموو ڕەنگەکانت بە ڕەنگی خۆت کاڵکردووە
هەتا توانیت باوزریانی ڕەشەبات لێ هەڵکردووە
خونچەیەکت بە دارەوە بەجێنەهێشت بۆ نیشانە
لە ژێر تینی کینەی خۆتا چەمەنت کرد بەوێرانە

# خەم

بە ناو وەرزێکا عومرم بڕیوە
کە قەت باخێکم تیا نەناسیوە
چڵی ئاواتم کە کەوتە چرۆ
رەشەبای قەدەر شکانی بێ هۆ

بادەی مەست بوونم تاڵاوی خەم بوو
مرواری خۆزگەم رەنگی لە دەست چوو
کەوتمە ژێر باڵی چەتری زەمانە
دڵم کەوتە ژێر خاکی ئەم ژانە

دیارە من و خەم لێکنابینەوە
بێ یەکتر هیچمان هەڵناکەینەوە
تازە من و خەم پەیوەستی یەکین
وەکو دوو لاولاو بەیەک شەتەکین

## ڕووخان

دوای تۆ کەپری عەشقم رووخا ، لێم وێران بوو خۆشەویستی
چەند جارێکە عاشق دەبم ، تۆ بێ خەتای ، دڵم ویستی
چەن جار شنە دابیێت لە رووم ، ڕەشەبایەک شێواندومی
لە دوای هەموو بەهارێکم ، کینەی پاییز وەراندومی
خەتای خۆمە لە دوای کەوتن ، واز ناهێنم لە ڕێی ئەوین
هانا دەبەم بۆ دڵێکی ، پڕ شەپۆلی سۆزی شیرین
ئەمە دواین جارم نییە ، کە وەکو گوڵ هەڵدەوەرێم
کە دوا گەڵای داری عەشقم زەرد ئەبێت و دێتە بەر پێم
باکت نەبێ تۆ نیت گوڵم ، من دڵی خۆم وام لێدەکا
بە هیچ وەرزێ ئارام ناگرێ و بە تەنهایی قەت هەڵناکا
وەکو باران لە باوەشی هەوریشا بم دێمە خوارێ
گەر ئاسمانم سامالیش بێت ، فرمێسکی خۆم لێدەبارێ

## غروور

بەنازەوە بۆم ئەڕوانی تیشکی نیگات وەک بلورە
من لە خەندەی تۆ تێناگەم ، ئاخۆ هەستە یا غرورە
چۆن بزانم پاییزی نیت ، گوڵی عەشقم لێوەردەگری
ناسکە دڵی من ناشکێنی ، بە وەڵامی سارد و سڕی
ویستم بڵێم خۆشم ئەوێی ، بەڵام گومان دەکەم هێشتا
لە غروری تۆ دەترسم ، بۆیە دڵم وا لە مشتا
پێت ناوەتە ناو هەستی من ، تەزووی عەشق بە ناخما دێ
دڵی خەستەو نیگەرانم ، بەخەندەی تۆ کەوتە سەر پێ
تۆ دەڕۆیت و من دڵنیام جارێکی تر ناتبینمەوە
خەمی تۆشم بۆ هاتە سەر ، یا وەک سێبەر بە شوێنمەوە
دە هیچ نەبێ کە غروریت ، بە تاسەوە بۆم مەڕوانە
خەندەی لێوت کۆکەرەوە و مەمخەرە ناو ئەم گومانە

# خۆر و خەزان

بەفرە و گەڵا چرپەی دوا یا ،عەشقە ئەمە تێناگەم من
غەدرە لە پڕ یادچوون لە بۆ دڵیان و هەست خەزان یا خۆر
بتوێتەوە گەش بەخۆری ، وایە بەفر چارەنوسی
ئەکرێتەوە ئەوا رووی بە گوڵ شکۆفەی و رەنگ کەچی
ئەسپێرێ گیان خۆر بە فر بە و ئەمرێ رەنگی خەزان بە گوڵ
ئەنێرێ خۆی ئاسمانی بۆ ، ماچ دوا چۆن کە بروانە تۆ
خاکا دڵی و هەناسەو بە ، ئەکا باوەش کۆچیا گەڵ لە
ناکا لەیاد ئاسمان و ئەرز ، خۆشەویستی و پاکیزەیی
ئاسمان و زەوی نێوانی لە وەریو گەڵای وەکو ئەویش
ناونیشان بێ ئاوی و کانی و رووبار بە سپارد گیانی
ئەنێژێ خۆی جەستەی بێرەنگ دەکاو ون خۆی سەری گەڵا
ئەرێژێ بۆ گەڵای گەڵا فرمێسک جێی لە ئەگری دار کە

# هەرەس خەم

چی لە هەستی دڵم بکەم عومرم خەون و خەیاڵییە
ڕۆژێ بژیم ، سەد ڕۆژ ئەمرم ، ژووانگەم چۆڵ و خاڵییە
ئاسان هاتووم بەڵام گوڵم گەڕانەوە بێ تۆ سەختە
خەمی دووریت تەزاندوومی ، وەک کرێوەو بەفرو شەختە
چی لە شەوی تەنیایی کەم ، ڕۆژ بۆ تۆ هانام پێ دێنێ
هەر تریفەی لێوەکانت ، هەرەس بە خەمم دەهێنێ
جەستەت وەکو گوڵی بەهار ، میهرەبانی وەک فریشتە
چی لە ژینی بێ سەمەرم ، تەنیا عەشقی تۆم لە پشتە
تۆ هەوارگەی دڵئارامیی و نەسیمێکی خەونی یەڵدای
دە زوو بگە بە کەنارم ، وەک شەپۆلی لەپی دەریای
خۆشەویستیت بارانێکە لە ناو ڕۆحما دایکردووە
تۆ فڕینی دڵی منت بەرەو لای خەم باڵکردووە

# لێپرسینەوە

بیستم هاتویت لێت پرسیوم ، پەشیمانی بۆ بینینم
حەزت ئەکرد وەکو نەمام ، لە شیعرێکما تۆ بڕوێنم
بەڵام ئەفسوس خامەی ماندووم ، بە ئازاری تۆ لەپێکەوت
دوا ئاوێنەی خەیاڵیشم ، بۆ شێوەی تۆ درزی تێکەوت
وانەزانی وەکو باران بەهاتنەوەت چرۆ دەگرم
ڕەنگی بەهارم بۆ دێنی و تەمی شوشەی چاوم ئەسڕم
ئێستا کە تۆ هاتویتەوە ڕەنگ و وەرزی من گۆڕاون
شادەماری هەستی جاران لە کانی دڵ دابڕاون
نا ئەزیزم گەڕانەوەت بۆ لای گوڵی ناو بیابانە
ئەو درەختەی سێبەر بوو بۆت ، ئێستا سوتوی ئاگردانە
ئاو و ئاگر لە هیچ شوێنێ تێکەڵ نابن بە ئاسانی
بەڵام دڵم سوتاو تەزی ، کەوتە لەرزە لە تاو ژانی

# بزوێنە

به لێوێکی ئاڵ به خەندەی شیرین
رەنگت بڕیوە له خۆری به تین
بڕوانە دڵم بە بێ تروسکە
تیشکی چاوی تۆش وەکو بروسکە

مەچەکی بەفرت تەنیا بەیەک خاڵ
منی خستۆتە ناو گۆمی خەیاڵ
پاوانە له پێت وەکو گوڵ دیلی
هەنگاو بە هەنگاو من بەجێدێڵی

خۆزگە ئەمتوانی وەکو ملوانکە
لەسەر گەردنت ببمە بەروانکە
دیارە تۆ زادەی پەری و فریشتەی
یان تۆ هەڵاڵەی ئەم باخ و دەشتەی